# بەرنابا

## ئینجیلی قەدەغەکراو

مژدەدەری هاتنی (محمد) بە پێغەمبەری دوا ڕۆژ




نوسینی

**حسن علی الصائغ**

وەرگێڕانی بەدەستکاریەوە

**شیروان شارەزوری**

چاپی یەکەم
١٤٣٤ هـ
٢٠١٢ ز

# بەرنابا

# ئینجیلی قەدەغەکراو

## مژدەدەری هاتنی (موحەمەد) بە پێغەمبەری دوا ڕۆژ

نوسینی

حسن علي الصائغ

وەرگێڕانی بەدەستکاریەوە

شـــیروان شـــارەزوری

(١٤٣٤ك ـ ٢٠١٢ز)

بسم الله الرحمن الرحيم



ناوی کتێب بەعەرەبی: برنابا الإنجيل المحرم

وفيه البشارة بنبينا محمد (ﷺ)

ناوی نوسەر: حسن علی الصائغ

ناوی کتێب بە کوردی: بەرنابا ئینجیلی قەدەغەکراو

مژدەدەری هاتنی لەوحەمەدا بە پێغەمبەری دوا ڕۆژ

ناوی وەرگێڕ: شیروان شارەزوری

چاپ و بڵاو کردنەوەی: چاپخانەی ڕێ نوێ و کتێبخانەی سەرمەد

بەرگ : ئاسۆ برهان

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم – ١٤٣٤ک – ٢٠١٢ ز

سلێمانی- بازاری ڕاپەڕین

٠٧٧٠١٤٦٢٢٩٥

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردنی (٢٧٧٣)ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی وەرگێڕ:

گومان لەوەدا نییە گاورانی وڵاتی ئێمە بوونیان کەمە، لەبەرامبەر ئەمەشدا موسوڵمانی گەلێك زۆرن، خۆ ئەگەر موسوڵمانێکی کرچ وکاڵیشبن ئەوا زۆرینەیان ڕۆشنبیرن، بە پێچەوانەی گەلانی دەرو دراوسێ لە خۆ ڕا بیرو باوەڕیان ناگۆڕێ، بەبێ بەڵگە ناچنە سەر هیچ بەرنامەو ڕێبازێ جا ئەگەر ڕێچکەیە یا بیرۆچکەیە پوچ و نا ڕاست بێ ئەوە زۆر بەدەگمەن چەکەرە دەکا، سێبەر دەکا...

لەو ئایینە بەر بڵاوانەی لەجیهاندا بوونیان هەیە، لە زۆر لەوڵاتانی بەناو پێشەکەوتوو جەماوەریان هەیە، مەسیحییەتە، کە بە کوردی پەتی خۆمان پێی دەبێژن گاور .. لە مێژە پتر لە دوو هەزار ساڵە مێخی داکوتاوە، بەردەوام لەم جێ لەو جێ ساباتێ هەڵدەدا، لە هەر جێ بینی خوان و سێبەری زۆرە، ئەوێ دەکاتە کڵێسە و بنکە..

پەیڕەوانی گاور لە سەر ڕێڕەو وپەیامی ئینجیل دەڕۆن، ئینجیلیش وەك قورئانی ئێمە یەك نییە، ڕاست و بێ خەوش نییە، بەڵکە زۆرن، یەك چەشن نین هەمە جۆرن، ئەمە مەتایە ئەوە لۆقایە، ئەمە دروستە ئەوە نادروستە، ئەمە دیارە ئەوە ونە، ئەمە ڕێپێدراوە ئەوە قەدەغەکراوە، لە ڕووی ناوەڕۆکیش بە هەمان شێوەیە: یەکێ دەڵێ عیسا خودایە، ئەو دەڵێ نا بەچکە خودایە، ئەوی دی دەڵێ: بەشێکە لەخودا ئەوی تر دەبێژێ نا فڕی بەخوایەتیەوە نییە، بەڵکە بەندەیە پەیامبەرە. ئەو دەڵێ: لە خاچ دراوە، ئەم دەبێژێ: بەرزکراوەتەوە، ئەو دەڵێ: هەستاوەتەوە، ئەوی دی هێشتا کاتی ماوە.. ئیدی گێژ دەبی، سەرسام دەبی لەم هەموو بەیت و باڵۆرەیە.. ڕاستی ونە، جاریش بدەی نایبینیتەوە نایدۆزیتەوە..

لەگەڵ ئەمەشدا مژدەدەرانی ئەم ڕێبازە بە زمانی لوس بە پارەو فلوس، بە لفتی شیرین بە گفتی زێڕین، بەشەو بەڕۆژ کەوتوونە نێو خەڵکی بانگەواز دەکەن مژدەدەن، دەزانی چ دەڵێن؟ پێت دەڵێن: عیسا بە خودا دابنێ، پاپا بەجێگری وی

دابنێ، خاچێ بەزێر بنەخشێنە، لەگەردنی بئاڵێنە لە هەر جێ بوی ڕایوەشێنە، تەواو لەدونیا خۆش بەختی، لەوی دی پاشای تەختی، جا چ دەکەی بیکە لە حەرام و حەڵاڵ ڕا مەمێنە، دەیکەی دەیبەی دەخۆی ئارەزوتە.. بەهەشت بۆ تۆ مسۆگەرە، جەهەننەمیش دووربێ لەتۆ بۆ دوژمنانتە..

گەر یەکێ ڕا بمێنێ بە روویاندا ڕا بوەستێ بلێ: ئاخر چون وادەبێ؟ بەڵگەت هەیە یا هەر قسەیە؟ لەجێی یەکێ چەندین قەشە و ئاخوند و مالومت لێ هەڵ دەشاخێ، چما ئێمە پیاز پادەکەین، کا بەبادەکەین، ئەی نابینی پەرتوکی پیرۆز؟ ئەی ئینجیلی خواناس مەتاو لۆقاو یۆحەناو مەرقەس، کرداری نێراوان وتەی پاپاو قەشەکان .. بەڵگە و فەرمایشت نین؟ ئایەتی خواوەندنین؟

تا باڵا دەست بوون .. بوونە خاوەن زێڕ خاوەن زۆر.. چەندیان فریودا.. جگە لە خۆیان بەلادەر بەگومڕا بەکافر دادەنا.. بەردەوام بوو بەردەوامیش دەبێ.. بەڵام لەسەدەی شانزەهەم یەك لەو ئینجیلە قەدەغە کراوانەی کە لە کۆڕی نیقیە دا و لە ساڵی (٣٢٥ز) قەدەغەکرا بوو، بەنێوی ئینجلی بەرنابا بوو، جارێکی دی دۆزرایەوە وهاتەوە کایە، خەڵکی بەئاگا هێنایەوە.. قەشەو مالومەکانی پەست ودەم بەست کرد خەڵکی تێ گەیاند پێ گەیاند کە عیسا بێ باوکە، کوڕی مەریەمی دایکە، خودا نییە بەندەیە، نە لە خاچ دراوە نە مردووە، بەڵکە بەرزکراوەتەوە و زیندووە.. دوا پێغەمبەر نییە، ئینجیلەکەشی دوا پەیام نییە، بەڵکە بە هاتنی موحەمەد مژدەدەرە، ئەو و بەرنامەی وی، گشتگیرە، مام ناوەندە، بەبێ جیاوازی بۆ هەموانە، لەلای خودا هەر ئەو تەواو وجوانە..

ئەم ئینجیلە کە بەزمانی ئیتاڵی نوسرابۆوە، پاشان وەرگێڕایە سەر زمانەکانی تر، مشت و مڕی نایەوە، چەندەها کۆڕی بۆ بەسترا، چەندین لێکۆڵینەوەی بۆ کرا، دەیان کتێبی لەسەر دانرا... جا یەکێ لەو کتێبانەی کە بەزمانی عەرەبی نوسراو بوو کە بە کورتی باسی ئینجیلی بەرنابا و ناوەڕۆکی دەکات، ئەو کتێبەیە کە (حەسەن عەلی صائیغ) نوسیویەتی، ئەم کتێبە بەراوردێك لە نێوان ئینجیلە

ڕێپێدراوەکان و ئینجیلی بەرنابا وقورئانی پیرۆز دەکات، وە بە کورتی لەسەر چۆنیەتی دۆزینەوەی ئینجیلی بەرنابا دەدوێ، وە بەزمانێکی ئاسان هۆندراوەتەوە، بۆیە پێم باش بوو وەریگێڕمە سەر زمانی باب وکەسی خۆم، تا ڕۆشنبیرانی وڵاتم بە ئاگابن، لە ناوەڕۆکی شارەزا بن، لەوەی دەوترێ بەنێوی حەزرەتی عیساوە وریابن.. زانیاریان زیاتر بێ، ژیانیان بەختەوەر تر بێ..

کاری ئەمنیش لەگەڵ ئەوەی هەموو کتێبەکەم وەرگێڕاوە، لەسەر ئەم ڕێڕەوە نوسیومەتەوە...

- لە هەرجێیەك دەقەکە ڕوون نەبووبێ وە پێویستی بە وشەیەك یا دەستەواژەیەك کردبێ ئەوە بۆم هێناوەو ماناکەم تەواو کردووە.
- ئەگەر لەجێگەیەکدا پێویستی بە هێنانی زانیاری کردبێ ئەوە لە پەراوێزدا بەکورتی ئەو زانیاریەم دەرخستووە لەدواییشدا ئاماژەم بە ناوی ئەو سەرچاوانە کردووە کە لێم وەرگرتووە، پاشان کۆتاییم هێناوە بە وشەی وەرگێڕ، تا جیا بکرێتەوە لەو پەراوێزانەی کە نووسەر نوسیویەتی.
- هەموو ئەو ئایەتانەی نوسەر هێناویەتی لەنێوان دوو کەوانەدا بەکوردی لە ناوەڕۆکی کتێبەکە، ڕاڤەو لێکدانەوەم بۆ کردووە، پاشان ئاماژەم بەسەرچاوەکان کردەووە لە پەراوێز دا.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوێنەرانی بەرێز ئەم پەرتوکە بەوردی بخوێننەوە وبیری لێ بکانەوە تا ڕوونبێتەوە ولێکجودا بێتەوە ڕاست لە چەوت، دروست لە نا دروست، گەر ڕاستیەکان بە چاو بخوێننەوە بە ئەقڵ و ژیری لێکی بداینەوە.... ئەوسا دەگەینە ئاسودەیی و خۆشبەختی و ژین دۆستی...

شیروان حاجی ناجی

سلێمانی - ٥/١/ ٢٠١٢ز

- ڕێڕەوی ئەم کتێبە:

١) پێشەکی یەکەم: ڕونکردنەوەیەك سەبارەت بە مزگێنی (ئینجیل) مەسیحیەتی ئەمڕۆ.

٢) پێشەکی دووەم: پێناسەو ناساندنی (ئینجیلی بەرنابا) و ئەو مزگێنی ونامانەی کەقەدەغەکراون، لەگەڵ دەرخستنی هۆکاری قەدەغەکردنیان.

٣) چیرۆکی مەسیح: باس وگێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەر عیسا (سڵاوی خودای لێبێت) بەکورتی وەبەوچەشنەی کەلەئایینی ئیسلامدا هاتووە.

٤) چیرۆکی مەسیح: بەپێی هەرچوار مزگێنی (مەتا، مەرقەس، لۆقا، یۆحەنا) کە ڕێپێدراون لەلایان مەسیحیەت، کە هەموویان بەیەك شێوە بەسەرهاتی عیسای کوڕی مەریەمیان بۆ دەگێڕنەوە، یەك لەو ئینجیلانە هەڵدەبژێرین و لەڕێی ئەوەوە بەسەرهاتی مەسیح دەگێڕینەوە.

٥) چیرۆکی مەسیح: بەپێی مزگێنی قەدەغەکراو (بەرنابا) دەگێڕینەوە، کەلەلایەن قەشەو پەیامبەر یوسفی بەرنابا، گێڕاوەتەوە، لەنێو ئەم ئینجیلەشدا، تێبینی سێ باسی گرنگ دەکەین، کەبریتین لە:

- خوایەتی مەسیح.
- لەخاچ دان.
- هاتنی پێغەمبەر (موحەمەد) درودی خوای لێبێت، وەك دوا پێغەمبەر.

## پێشەکی یەکەم:

### ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بە ئینجیلی مەسیحیەتی ئەمڕۆ.

ئینجیل: لەزمانی یۆنانیدا بەواتای (البشارة ـ مژدە یا مزگێنی) دێت[١]. ژمارەی ئەو مزگێنییانە زۆرن، بەڵام ئەوەی ڕێپێدراوە لەلایەن کڵێسە لە (مجمع نیقیە[٢] ـ کۆمەڵەی نیقیە) لەساڵی(٣٢٥ز) تەنها چوار مزگێنییە، بەناوی: ئینجیلی مەتا، ئینجیلی مەرقۆس، ئینجیلی لۆقا، ئینجیلی یۆحەنا..

زۆرێك لە مزگێنییەکانی دیکە پشتگوێخران وقەدەغەکران بەتایبەت ئینجیلی بەرنابا، کە بەتایبەت باسی لێوەدەکەین ئەوەی مەبەستە لێرەدا ئاماژەی پێبکەین مانا و ناوەڕۆکی ئینجیلە، بزانین لەچی دەدوێ؟

هەموو ئینجیلەکان ناوەڕۆکیان لە دەسپێك و لەدایك بوونی یەسوع ـ ڕزگار[٣] المسیح ـ سڕەوە[٤] عیسای کوری مەریەم (سەلامی لێبێت) دەکات تا کۆتای مژدەکانی..

---

[١] لە وشەی ئیڤانجلیۆن ـ (EVANGELION) ی یۆنانییەوە هاتووە، بە واتای هەواڵی خۆش، مژدە.. بنوارە کتێبی: التخجیل من حرف التوراة والإنجیل:١/ ٨٠، وەرگێر.

[٢] نیقیە: شارێکە لە ئیتالیا.

[٣] وشەی: (الیسوع) : بەمانای مژدەی ڕزگارکەر دێت، بەواتای خەڵکی لەتاوانەکانی ڕزگار دەکات.

[٤] وشەی (المسیح) : لەزمانەوانیدا بە حەوت واتا دێت:

١) سڕەوە: ئیبنو عەباس دەڵێت: بۆیە بەحەزرەتی عیسا وتراوە مەسیح چون دەستی بەسەر هەرنەخۆشییەك بهێنابایە ئەوا دەست بەجێ ئەو نەخۆشیەی نەدەماو دەیسڕییەوە.

٢) هاوڕێ: ئیبراهیمی نەخەعیش دەڵێت وشەی مەسیح بەمانای (الصدیق) واتە هاوڕێ دێت.

٣) گەشتیار: ئەحمەدی کوری یەحیاش دەڵێت: بەواتای ئەوەدێت کە هەموو زەوی گەڕاوە.

٤) لەوتەیەکی تردا ئیبنو عەباس دەڵێت: بۆیە پێیوتراوە مەسیح لەبەرئەوەی بن پێی تەخت بووە.

٥) گەشتیار: وەهندێکیتر پێیان وایە کە لە گەڕان بەسەر زەویدا هاتوە چون حەزرەتی عیسا هەموو سەر زەوی گەڕاوە.

ئەوەی دیارو ئاشکرایە کە هەر چوار مزگێنییە ڕێپێدراوەکە جیاوازیەکی کەمیان هەیە لەگەڵ یەکتریدا، لەهەندێ باسدا یەکیان لەوی دی کەمێ ڕونکردنەوەی زیاترە یاکەمترە.

هەر چوار ئینجیلەکە دەباش بوون بەسەر چەندبەشێکدا، وەهەربەشێك دابەش بوەبەسەر چەندبەشێکی تردا پێی دەوترێت: (إصحاح - بەش). مزگێنی مەتا پێکهاتووە لە (٢٨بەش - اصحاح)، مزگێنی مەرقۆس لە (١٦ بەش)، وئینجیلی لۆقا لە (٢٤ بەش)، وئینجیلی یۆحەنا لە (٢١بەش)، وەهەر بەشێك (إصحاح) لە چەند برگەیەك (فقرة) پێك دێت، بۆ نمونە بەشی یەکەم لە ئینجیلی قەشە مەتا لە (٢٥برگە) پێك هاتووە، وەهەموو برگەیەك لە دوو دێڕ کەمتر یا لەدێڕك کەمتر پێك هاتووە.. بەوشێوەیەی کەلەئینجیلەکەدا دەبیندرێت.

هەر چوار ئینجیلەکە لەگەڵ بیست وسێ کتێبی تردا دەبنە بیست وحەوت کتێبی پیرۆز لەلای گاورەکان، وەئەو (٢٣ کتێبە) لەخۆگری نامەکانی (قەشە پۆڵس)ن، ئەو نە لە هاورێ دڵسۆز و پاکەکانی (حوارییِن)[1]ی حەزرەتی عیسا بووە، وە نە لە

---

٦) بەرۆن چەورکراو: بەشێك لەزانایانی تردەڵێن: لەوەوە هاتووە کە کاتێ لە دایك بووەبەرۆن چەوربووە.

٧) ئبنو سەلامیش دەڵێت:مەسیح لەزمانی عەرەبیدا بەدوو واتا دێت، یەکەم مەسیحی دەجال، دووەم مەسیحی عیسی کوڕی مەریەم، ئەگەر لە بنچینەدا بەمانای دەجال هاتبێ ئەوە لەبەر ئەوەیە کەچاوێکی سڕاوەتەوەو نیەتی، وەئەگەر لە بنچینەدا بەحەزرەتی عیسا وترابێ ئەوا وشەی عیسا لەزمانی عیبریدا لە(مشیحا) هاتوەو عەرەب پیتی(شین)ی گۆڕیوە بە پیتی(سین) پاشان بۆتە (مەسیح)..بڕوانە: کتێبی: الزاهر فی معانی کلمات الناس، لأبي بكر الأنباري:٣٣٧/١، الجامع لأحكام القرآن : ٨٩/٢، وەرگێڕ.

[1] هاوڕێیانی حەزرەتی عیسا بۆیە پێیان وتراوە(الحواریون) لەبەر ئەوەی دڵسۆز ونیاز پاك و ڕەوشت جوان بوون. زوبەیدی خاوەنی(تاج العروس) دەڵێت: ((الحواري: الحميم والناصح...وتأويل الحواريين في اللغة: الذين أخلصوا ونقوا من كل عيب..)) واتە: حەواری بە کەسێکی زۆر نزیك و خۆشەویست

پەیامبەرو قوتابیەکانی بووە، وەهەروەها لە خۆگری کاری پەیامبەرو هاوڕێیانی حەزرەتی عیسان کە هەڵی بژاردون کە هەستن بە کاری(التكريز - ئامۆژکاری)[١]، وژمارەی هاوڕێ دڵسۆزەکانی حەزرەتی عیسا دوازدەکەس بوون بەناوی:

١) سەمعان، پێشی وتراوە(بطرس - بوتروس). ٢) أندراوس - ئەندراوس، برای سەمعانە. ٣) یەعقوب کوڕی زەبری. ٤) یۆحەنای برای یەعقوب. ٥) فیلبس. ٦) بەرسو لمادوس. ٧) توما. ٨) مەتای ئەلعەشار. ٩) یەعقوب کوڕی حەلەفی. ١٠) ولباس، بەناوبانگەبە: تداوس. ١١) سەمعان ئەلقانونی. ١٢) یهوذا الأسخريوطي[٢] یەهوزای ئەلئەسخەریوتی.

ئەم دوازدەدە قوتابیە ئەوانەن[٣] کە حەزرەتی عیسا وەسێتی بۆکردن پێی وتن: ((..مەچنە شاری سامریەکان[٤]، ڕێگای نەتەوە بێ باوەڕەکان مەگرن، بەڵکو

---

وئامۆژگاری کەر دەوترێ ولە زمانەوانیشدا: ئەوانەن کە دڵسۆزو پاکن لە هەموو خەوش و نەنگیەك. بڕوانە: تاج العروس، لزبيد:٤٢/٢، وەرگێڕ.

[١] وشەی (التكرين): بەواتای ئامۆژگاری دێت، وە زۆر جار دوبارە بۆتەوە لە ئینجیلدا.

[٢] یهوذا الأسخريوطي: یەکێك بوو لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی حەزرەتی عیسا، زۆر پابەندی فەرموودەکانی بوو، وەخاوەنی کەراماتێکی زۆر بووە، هەروەك لەبەشی دەیەم لە ئینجیلی مەتا هاتووە، بەڵام دینەکەی بە دنیا دەفرۆشێت، وە بە(٣٠ درهەم) حەزرەتی عیسی ڕادەستی جولەلکەکان کرد، پاشان لەبری حەزرەتی عیسا دەیگرن ودەیدەن لەخاچ ودەیخنکێنن هەروەك چۆن باسی هاتووە لە بەشی ٢٧ لە ئینجیلی مەتا، بڕوانە کتێبی: إظهار الحق:٢٦٩/٢، وەرگێڕ.

[٣] ئەوە ناوی دوازدە هاوڕێ وقوتابیە نزیکەکانی حەزرەتی عیسان، وەك چۆن ناویان هاتووە لە چوار ئینجیلە ڕێپێدراوەکان لەلایەن گاورەکان.

[٤] سامریەکان: ئەوانە بوون کەلە ناوەڕاستی وڵاتی فەلەستین نشتەجێ بوون، پێشتر لە سەر ئاینی بت پەرستی بوون، وەپایتەختەکەیان کەشاری (سامیرە) بوو لە ساڵانی ٨٧٦ - ٨٤٢ی پێش زاینی دروست کراوە.. بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی:ل٢٦. وەرگێڕ.

بەتايبەتی برۆنە لای مەڕە ون بووەكانی ئیسرائیل، كاتێ ئێوە ئەچن ئامۆژگاری بدەن وبڵێن: پادشایەتی ئاسمان[1] نزیك بۆتەوە))[2].

ئەو بیست وسێ كتێبەی كەلەلای گاورەكان پیرۆزە، باس لە دروست بوون وگەشەسەندن وبلاوبوونەوەی كڵێسە دەكا، هەروەها باس لەو نامانە دەكات كە قەشە پۆڵس نوسیویەتی، ونامەی پەیامبەرەكانی تری حەزرەتی مەسیح، پاشان ئاماژە بە باوەڕهێنان بە مەسیحی ڕزگاركەر دەكات وئامۆژگاری بەنەكردنی هەڵە وتاوان دەكات، وهەروەها ئاگاداری شوێنكەوتوانی دەكات لە بەنو ئیسرائیل كە چۆن رەفتاریان گۆڕا بەهۆی ئەوەی شوێن دونیاو پارەو سامان كەوتن وپشتیان كردە پەیامی حەزرەتی موسا (سلاوی لێبێت)، وە چۆن دەستكاری پەیامەكەیان كرد تا وای لێهات چەندین قسە وباسی هەڵبەستراویان خستە ئەو پەیامەوەو بەنێوی پایامی پیرۆز بلاویان كردەوە.. لەكۆتایی ئینجلیشدا باسی ئەو خەونی خوایەتی یۆحەننا[3] دەكات، كە بریتیە لە پێشبینیەك كە خەون وهێما دەكاتە

---

[1] ملكوت السماوات ـ پادشایەتی ئاسمان: لەلای گاورەكان بریتیە لەو شانشینەی كە دوای ئەم ژیانە دروست دەبێت، خودا عیسای كوڕی مەریەم دەكاتە دەسەلاتدار.. بنواڕە: مزگێنی مەتا بە كوردی:ل٢٦. وەرگێڕ.

[2] ئینجلی مەتا: بەشی ١٠/ برگەی ٥ ـ ٨.

[3] رؤیا یوحنا اللاهوتي ـ خەونەخواییەكەی یۆحەنا: بریتیە لە پێشبینیەكانی ئەو قەشەیە كە وەك خەون بینیویەتی وەلە ٢٢ بەش ـ إصحاح ـ پێك هاتووە.. سەبارەت بەم نوسراوە پیرۆزەی گاورەكان لەكۆنەوە قەشەكان لەنێو كڵێسە بیروڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە خەونە خواییەكەی یۆحەنا، هەندێكیان پێیان وایە: ئەو نوسراوە هی یۆحەنای كوڕی زیدی قوتابی حەزرەتی عیسایە، واتە یەكێكە لە ١٢حەواریەكەی مەسیح. وەهەندێكیتر گومانیان هەیە كە ئەو بێت، وە لەم سەدەیەی ڕابوردووەوە لێكۆڵینەوەیەكی تازەی لەسەركرا گەیشتنە ئەوەی كە نەخێر ئەوە یۆحەنا نییە بەڵكو قەشەیەكی خوێندنگەی كڵێسەی ئەسكەندەریەی فەلسەفی میسرە..بنواڕە: الأناجيل الأربعة ورسائل بولس ويوحنا:١/١٥٤، وەرگێڕ.

هۆکاریٚ بۆ بروا هێنان بەبانگەوازی حەزرەتی مەسیح، وەدەرخستنی ئەو کۆسپ وناڕەحەتیانەی کەدێتە ڕێی باوەڕەکەیان، وهەروەها ئاماژە بە هاتنەوەی حەزرەتی مەسیح دەکات بۆ سەر زەوی بۆ جاری دووەم، پاشان باسی ڕۆژی دوایی و ئاسمان و جەهەنەم دەکات...

بەڵێ: هەر چوار ئینجیلەکە (مەتا، مەرقەس، لۆقا، یۆحەنا) لەگەڵ بیست وسیٚ کتێب ونامە پیرۆزەکانی دیکە لەلای گاوران وشوێنکەوتوانی پێیدەڵێن:(العهد الجديد ـ پەیمانی سەردەمی نویٚ) بەڵام (العهد القديم ـ پەیمانی سەردەمی کۆن) هەروەك چۆن لە ئینجیلدا هاتوە بریتیە لە (العهد الذي عاهد به الله موسى في جبل سينا ـ ئەو پەیمانەیەکە خوا بە موسای دا لە کێوی سینا)، وەپەیمانی کۆن پێکهاتووە لە ئەو نوسراوانەی کەپێش حەزرەتی عیسا هاتوون، وەك (مزامير داود ـ سروود ومونا‌جاتی داود)[1] وە پەند ودانابیەکانی حەزرەتی سولێمان...وەهەر دوو پەیمانی سەدەی کۆن و نویٚ پێکهێنەری (الكتاب المقدس ـ کتێبی پیرۆز)ن لەلای گاورەکان[2].

---

[1] (سروودەکانی داود ـ مزامير داود) بریتیە لە: چەند سروود ومونا‌جاتێکی ڕۆحانی کە باس لە گەورەیی وپاکی وبیٚ خەوشی پەروەردگار دەکات، وە زۆربەی ئەو سرودانە خراونەتە پاڵ حەزرەتی داود (سلاوی خوای لێبێت) وئەم سرودانە بەشێکە لە پەیامی پیرۆز لەلای جولەکەو گاورەکان، بنواڕە: کتێبی: موسوعة اليهود واليهودية والصهيونية: لعبد الوهاب المسيري: ١٣/١٩٥، وەرگێڕ.

[2] خاوەنی کتێبی: (التخجيل من حرف التوراة والإنجيل) بەم شێوە کتێبی پیرۆزی دابەش کردووە:

- یەکەم: العهد القديم ـ پەیمانی سەدەی کۆن: بریتیە لە جزم وبەندی ئەو پێغەمبەرانەی کەپێش حەزرەتی عیسا ژیاوون، لەوانە: (تەورات).
- دووەم: العهد الجديد ـ پەیمانی سەردەمی نویٚ: پێکهاتووە لەو جزم و نوسراوانەی کەلەسەردەمی حەزرەتی عیساوە دەرکەوتون، وبریتین لە سیٚ بەش:
  - بەشی یەکەم: بەش و جزمە مێژووییەکان: بریتیە لەچوار مزگێنیە ڕێپێدراوەکە، وەهەروەها: نوسراوی کار ورەفتاری پەیامبەرەکانی حەزرەتی عیسان.

وهەر چوار ئینجیلەکە وەك باسمان کرد لەیەکەوە زۆر نزیکن لە گێڕانەوەی باس و چیرۆکی حەزرەتی عیسا (سلاوی خوای لێبێت) ئەوەشمان بیر نەچێ کەحەزرەتی عیسا ئەودەمەی دەستی بەبلاوکردنەوەی ئاییني پاکی خودای کرد تەمەنی (٣٠سالٚ) بوو، بەردەوام تا سێ سالٚ بانگەواز وئامۆژگاری نەوەی بەنی ئیسرائیل ـ جولەکەکانی کرد..

لەم کتێبەشدا ئێمە یەکێ لەو چوار ئینجیلە دەهێنینە ڕووی خوێنەر لە ناوەڕۆکیدا لێکۆلینەوە دەکەین، ئەویش (ئینجلی مەتا)یە، لەبری هەر سێ مزگێنیەکەی تر ئاماژە بە بابەتەکانی دەکەین، بەو ئەندازەیەی یە کە خزمەت بە باسەکەمان بکات، وەلە نێو بەشەکانی ئەو ئینجیلەشدا چەند نمونەیەك وەردەگرین.. تا دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە بۆتە هۆی دانانی ئەم لێکۆڵینەوەیە..

*************

---

– بەشی دووەم: جزم ونوسراوەفێرکاریەکان: ئەمەش بریتیە لە نامەکانی هاورێ و قوتابیەکانی حەزرەتی عیسا.

– بەشی سێیەم: خەون و گەشبینیە خواییەکی یۆحەنا ـ رؤیا یوحنا اللاهوتي.

بنوارە کتێبی: التخجيل من حرف التوراة والإنجيل:١/ ٨٠، وەرگێر.

**پێشەکی دووەم:**

## پێناسەو ناساندنی (مزگێنی بەرنابا) وەئەو ئینجیل ونامانەی کەقەدەغەکراون لەگەڵ دەرخستنی هۆکاری قەدەغەکردنیان.

نازناوی (بەرنابا) بەواتای پەندیار یا ئامۆژگار یا ئاگادارکەرەوە دێت لە وەرگێڕانی پیتی ئەم وشەیە بەواتای (ابن الوعظ - کوڕی پەندیار دێت)، ناوی ڕاستەقینەی (یوسف)ە، لەبنچینەدا خەڵکی قوبرسە پاشان کۆچی کردووە بۆ (فەلەستین)، پاش چەند جەنگ وشەڕ و شۆڕێکی زۆر جولەکەکان دەستیان بەسەر ئەوناوچەیەدا گرت، کردیتانە وڵات ونیشتەجێی خۆیان، لەگەڵ مانەوەی خەڵکە سەرەکیەکەی ئەوێدا (کەنعانیەکان وفەلەستینیەکان ویەبوسیەکان) پایتەختێکیان لەوێدا دامەزراند بەنێوی (ئۆرشەلیم) لەجێگای ئەو شارەکۆنەی کە ناوی (یەبوس) بوو..

بەرنابا لەگەڵ (قەشە مەرقۆس) - خاوەنی مزگێنی دووەم - بەخزمایەتی دەگەنەوەبەیەك.

یوسفی بەرنابا بەیەکێك لە متمانە پێکراوەکانی کڵێسەی گاورەکان دادەنرێت، خاوەنی پلەو پایەیەکی یەکجار زۆر بووە، چون هاوچەرخی حەزرەتی عیسا بووە، لەپێش وی لەدایك بووە، هاوڕێیەتی کردووە، وەلەدوای ئەویش ژیاوە(لەدایك بووی ساڵی ٣ی پ.ز - ولەساڵی ٥٩ز کۆچی کردووە) لەوەش زیاتر لە سێ ساڵی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی عیسادا هاوڕێیەکی زۆر نزیکی بووە..تا کۆتایی بانگەوازی حەزرەت.

هەروەها یەکێ بووە لە نێراوە دیارەکان کە بوونەتە هۆی بڵاو بونەوەی ئایینی مەسیحیەت.لە چارەکی دووەمی سەدەی یەکەمی زایینیدا شان بەشانی دوانزدە هاوڕێ و قوتابیەکانی حەزرەتی عیسا وەك (قەشە بوتروس) بانگەوازی کردووە.

قەشە (پۆڵس)ـ یەکێکە لە بەناوبانگترین و دیارترین قەشە و نێراوە مەسیحیەکان[1] - بەردەوام هاوڕێیەتی قەشە (بەرنابا) بوو لە دوای کۆتایی بەنگەوازی مەسیح، شاول کەناوی ڕاستەقینەی قەشە (پۆڵس)ە پێش ئەوەی ئایینی مەسیحی وەربگرێ سزاو عەزێتی ئەوکەسانەی دەدا کە باوەڕیان بە حەزرەتی عیسا دەکرد [2].

پاش ئەوەی قەشە (پۆڵس) باوەڕی هێنا بەمەسیح، قەشە (بەرنابا) لەبەردەم هاوڕێ وقوتابیەکانی ناساندی و پەسەندی کرد، ڕازیکردن بەوەی کە باوەڕی هێناوە، وەباوەڕەکەی جێی متمانەیە[3].

هەموان گەواهی دەدەن لە سەر باوەڕی پتەو و ڕاستگۆیی ودڵسۆزی قەشە (بەرنابا)، لەو دەمەی حەزرەتی عیسای ناسی باوەڕی هێنا، بە پەلە ماڵ وکێڵگەکەی فرۆشت وخستیە بەردەستی حەزرەتی عیسا وبەخشی لە پێناو بانگەوازی مەسیحیەت. ئەوەتا خودی ئینجیل شایەتی ئەم ڕاستیە دەدا، لە کرداری نێراواندا لە برگەی (٣٦ ـ٣٧)دا بەئاشکرا باسی ئەوە دەکات و دەڵێت: ((یەکێ لەوانە یوسف ناوێك بوو کەنێراوان بانگیان ئەکرد بە بەرنابا بەواتای ڕۆڵەی هاندەر ـ

---

[1] لەدوای بانگەوازی حەزرەتی عیسا بوو بە نێراو (رسول).

[2] بنواڕە: مزگێنی: کرداری نێراوەکان، بەشی نۆیەم برگەی ١ تا ٣.

[3] بنواڕە: مزگێنی: کرداری نێراوەکان، بەشی نۆیەم برگەی ٢٦ ـ ٢٩

ئامۆژگاریکەر ـ ئەو لە تیرەی لاوی بوو، رەگەزنامەی قوبروسی هەبوو، ئەم کابرایە کێڵگەیەکی هەبوو فرۆشتی ونرخەکەی خستە بەردەم نێراوانەوە))[١]

بەڵام لەسەر چۆنیەتی بانگەواز لەنێو گەل ومیللەتاندا لەدوای حەزرەتی عیسا ناکۆکی وجیاوازی کەوتە نێوان قەشە (پۆڵس)[٢]. وقەشە (بەرنابا)، بەهۆی ئەوەی قشە (پۆڵس) زۆرێك لە فەرمان و پەیڕەوەکانی ئایینی مەسیحی شاردبۆوەو نەیدەدرکاند، بەو بیانوەی کەمیللەتان پێیان خۆش نابێ بەشێ لەو داب و نەریت و دروشم و فەرمانانە جێ بەجێ بکەن بۆ نمونە وەك خەتەنەکردن، قەشە بەرنابا لەپێشەکی مزگێنیەکەیدا دەڵێت: ((ئەی بەڕێزان: خوای گەورەو سەرسوڕهێنەر[٣] لەم ڕۆژانەی دواییدا بەسەری کردینەوە بە پێغەمبەرەکەی عیسای مەسیح، بەسۆزێکی زۆرەوە تا فێرببین، لەو بەڵگانەی کە شەیتان کردویەتیە هۆکارێ بۆ گومراکردنی زۆرێك لەخەڵکی بەناوی تەقواو خواپەرستی، مژدەدەرن بە فەرمانێ کەزۆر کوفر وبێ باوەڕیە، دەڵێن: مەسیح کوڕی خوایە، وازیان لە خەتەنەکردن هێناوە کە خودا هەمیشە فەرمانی پێکردوە، بەدروست و حەڵاڵی دەزانن هەموو

---

[١] بنوارە: مزگێنی: کرداری نێراوەکان، بەشی چوارەم برگەی ٣٦ ـ٣٧.

[٢] چیرۆکی باوەڕ هێنانی (شاول): لە کۆتایی بانگەوازی حەزرەتی مەسیح لەسەر زەوی، کاتێ شاول بەشێ لەباوەڕدارانی بەرەو گرتوخانەو ئەشکەنجە دەبرد گوێی لەدەنگێك بوو لەئاسمان بانگی دەکرد: شاول، شاول بۆچی ئەم چەوسێنیتەوە؟ لەوکاتەدا چاوی لە بینین کەوت...لەدوای سێ ڕۆژ یەکێ لە قوتابیەکانی مەسیح خەونێکی بینی بە مەسیحەوە پێیوت کە بچۆ بۆ ماڵی شاول، وەدەست بهێنێ بە چاوی شاولدا، پاشان چوو بۆلای ئەو کارەی کردو چاوی چاك بۆوە، ئەویش باوەڕی هێنا بوە کەسێکی چالاك لەبانگەوازی ئایینی مەسیحیەت، وەبووە یەکێ لە متمانەپێکراوەکان لەو ئایینەدا... بنوارە: مزگێنی: کرداری نێراوەکان، بەشی نۆیەم برگەی ١ ـ ٣.

[٣] لە دەقە عەرەبیەکەدا بەم چەشنە هاتووە(ان الله العظيم العجيب..) ئەم ئاکار وناوە دروست نییە بۆ خوای گەورە بەکار بهێنین، چون یەکێ نییە لەناوە جوانەکانی وئاکارێ نییە لە ئاکارە بەرزەکانی..وەرگێڕ.

گۆشتێکی پیس، ئەوەی لەو نێوەندەدا گومڕا بوو (پۆڵس)ە، کەناتوانم باسی لێوەبکەم بەبێ خەم وپەژارە، ئەمەش بووە هۆی نوسینەوەی ئەوەی ڕاست و دروستە ئەوەی بینیومە و بیستومە کاتێ لەخزمەتی عیسا دا بووم، تا پاك ببنەوەو شەیتان فریوتان نەدا، کەلە نێو بچن وبکەونە لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت، لێرەشەوە بە ئاگابن لە هەموو کەسێ کە مژدەتان پێدەدا بەفەرمان و ڕێسای تازە کە پێچەوانەی ئەوەیە کە دەینوسمەوە تا پاك ببنەوە بە پاك بونەوەیەکی هەمیشەیی))[1].

هەندێ هۆکاری دیکە هەبوون بۆ برەودان و بڵاوبونەوەی بانگەوازی مەسیحیەت، وەك: زیندوبوونەوە لەدوای مردن، ئەمەش کاری بەردەوامی هەموو ئایینە جیاواز و هەمەچەشنەکانی ئەو کاتە بوو وەکو: (الوثنية) - بت پەرستەکان و ئەوانەی سروشتیان ئەپەرست.. باوەڕ بە زیندووبوونەوە لە پاش مردن لەگەڵ زۆرێ لە ویست وحەزەکانی نەفسدا دەگونجێ، چون نەفس پێی خۆشە کەجارێکی دی ژیان هەبێ لە پاش مردن، لەبەر ئەم هۆیەو چەندەهای تر ڕێڕەوی قەشە بۆڵس بڵاوبۆوەو پەرەی سەند لە نێو گەلاندا، کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکی بەرەو گاور بوون دەچوون، بەو هۆیەوە لەنێو گەلە هەژار و چەوساوە و ماف خوراوەکان وبێبەش لە کەمترین پێداویستیەکانی ژیان لەسەردەمی ڕۆمانیەکان ئایینی مەسیحی کەوتەبرەو.. ئەو خەڵکە دیتیان مەسیحیەت ڕزگاریکەرەو، هیوایە بەژیانێکی دواڕۆژ، ئەوەی لێی بێبەش کراون بۆیان قەرەبوو دەبێتەوە لە ژیانێکی نوێدا

هەروەها لەلای قەشە (پۆترۆس) چەند بۆچونی دیکە هەبوون بۆ بانگەواز لەنێو گەلاندا جیاواز لە بۆچونی ڕێگاو شێوازەکەی قەشە(پۆڵس).

---

[1] پێشەکی قەشە(بەرنابا) لە مزگێنیەکەی، بڕگەکانی ٢ تا ٩.

لەگەڵ ئەو تەکتیکەدا - گەر باشم وتبێ - لە شێوازی بانگەوازدا، ئەوەی قەشە(پۆڵس) هەڵگری فەلسەفەیەکی قوڵە کەلە یۆنانیەکانەوە وەری گرتووە لە چۆنیەتی قەناعەت و قایلکردن بەبەڵگەی بەهێز..

بەڵێ ئازیزان: مزگێنی (بەرنابا) یەکەم ئینجیل نەبوو کە قەدەغە بکرێ لەلایان کڵێسەی کۆمەڵەی (نیقیة) لەساڵی (٣٢٥م)، وەبە هەمان شێوە لەلایەن پاپا (جالاسیوسی یەکەم) - کە بۆ یەکەم جار لەساڵی (٤٩٢م)دا چووە سەر کورسی پاپایی - ، بەڵکو زۆرێك لەو ئینجیلانە قەدەغە کراون وەك: مزگێنی پۆترۆس، مزگێنی مەریەم، مزگێنی ئەلئەغنەتی، ومزگێنی ئەلسەبعین، مزگێنی ئەلتەزکیرە، وەجزمی ئەخنوخ، مزگێنی عیسا، کە عیسا خۆی باسی لێوەکردوە، وەمزگێنی مەرقۆس ئاماژەی پێکردووە لە (بەشی یەکەم - بڕگەی ١٤) لە مزگێنیەکەیدا.

وەچەندین مزگێنی ونامە لەنێوچوون لەو ماوەیەی کەمەسیحیەکان کەوتنە ژێر ئازارو ئەشکەنجە لەسەرەتای بانگەوازی مەسیحیەت لەلایەن ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانیەکانەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە گاورەکان نەدەچونە ژێر فەرمانی سەرکردەی ڕۆمانیەکان بەو بیانوەی کەڕۆمان وەچەی خواوەندە، بۆیە تۆمەتبارکران بە پیلان گێڕی دژی دەوڵەت، بەم هۆیەشەوە زۆرێك لە گاورەکان کوژران بەشێکی دیکە توشی ئەشکەنجەبوون دەخرانە بەردەم شێر لە یاریگاکانی ڕۆمانیەکان، وەهەروەها فەرمانڕەوای ڕۆمانیەکان (نەیرون) تۆمەتباری گاورەکانی کرد بە سوتاندنی ڕۆما، بەمەش زۆرێکی تر کەوتنە بەر ئازارو سزاو ئەشکەنجە...

بەڵام لە ساڵی (٣١٣ز) ئیمبراتۆر (قوستەنتین) فەرمانێکی دەرکرد بەوەی کە مەسیحیەت ئاینێکی فەرمیە لەگەڵ ئاینەکانی تری ئەو دەمە، وەخەڵکی ئازادن لە پەیوەست بوون و وەرگرتنی وە لە ساڵی(٣٨١ز) لە سەردەمی ئیمبراتۆر

(تیودوسیوس)دا فەرمان دەرکرا کە ئایینی فەرمی وڵات ئایینی مەسیحیەتە، بەم هۆیەشەوە کڵێسە پەرەی سەند..[1] وەجارێکی تر ئینجیل ونامەکان دەرکەوتنەوەو دەدرانە دەست کڵێسە، پاشان کڵێسەش بڕیاری لە چارەنووسی ئەو ئینجیلانەدا[2]

وەك باسمان کرد لە نێو ئەو هەموو ئینجلانەدا تەنها چوار ئینجیلیان ڕێ پێدراوە لەلای کڵێسەکانی مەسیحیەتی ئیمڕۆ، بەڵام مێژوو بۆمان باس دەکات لە سەدە کۆنەکاندا چەندەها ئینجێلی تر هەبوون ڕێپێدراو بوون لەلایەن تاقم و گرۆهە جیاوازەکانی کۆنی مەسیحیەت، چون لای هەرکۆمەڵەیەکی مەسیحی جۆرە ئینجیلێك ڕێپێدارو بوو، بۆ نمونە شوێنکەوتوانی مەرقیەکان (أصحاب مرقیون) وشوێنکەوتوانی دەیسان (أصحاب دیصان) ئینجیلێکی جیاوازیان بووە لە هەموو ئینجیەلەکانی تر، وەهەروەها شوێنکەوتوانی مانی (أصحاب مانی) ئینجلێکی جیاوازیان هەبووە لە چوار ئینجیلە ڕێپێدراوەکە، هەموو تاقمێك پێی وایە ئینجیلەکەی خۆی ڕاستەو ئەوی تر هەڵە و نادروستە.. ئینجیلێکی ترمان هەیە بەنێوی ئینجیلی تەزکیرە، ئینجلی سەرن تەهەس، بەوجۆرە چەندەها ئینجیل هەبوون وەك مێژوو نوسان دەڵێن، ئەوەش بوو پاڵی بە کڵێساوە تا لە کۆتای سەدەی دووی زایینی وە هەروەها لەسەرەتای سەدەی چواری زایینی کۆببنەوەو ئەو چوار ئینجیلە (مەتا، مەرقۆس، لۆقا، یۆحەنا) هەڵبژێرێت ڕێ بە دروستیان بدەن، وەئەوانی دی قەدەغە بکەن[3].

---

[1] بڕوانە: تأريخ حضارات العصر الروماني ب. المسيح يبشر بالمسيحية.

[2] بڕوانە: مقارنة الأديان: ج٢، المسيحية .د.أحمد شلبي:ط١٩٨٤م ص٢٠٧ ـ ٢٠٨.

[3] بڕوانە: محاضرات في النصرانية الشيخ محمد أبو زهرةص٤٣.

## قەشە ئەریوس کێیە؟ وەکۆڕی نیقیە ـ مجمع نیقیة ـ چۆن بەسترا؟

هەروەك لەکتێبی (محاضرات في النصرانية ـ چەند وانەیەك لەسەر گاورەکان) کە شێخ موحەمەد ئەبو زەهرە دایناوە، هاتووە کە قەشە ئەریۆس: ((پیاوێکی دیارو بانگخوازێکی بەرچاو وئازاو زۆرزانی گاور بووە لە میسر، دژایاتیەکی بەهێزی کڵێسەی ئەسکەندەریەی کردوە، بەتایبەت لەسەر ئەوەی ئەو کڵێسەیە بانگەشەی بۆ خوایەتی عیسی (سلاوی خوای لێبێت) دەکرد، ئەو دژایەتی ئەمەی دەکرد دەیگوت خودا یەکەو هەرئەو شیاوی پەرستنە، ئەوەی لە مزگێنیەکانیشدا هاتووە سەبارەت بەخوایەتی عیسا درۆیە ودورن لەڕاستیەوە.. کڵێسەی ئەسیوت(أسیوط) لە سەر ئەو بۆچونە بوو وەلەسەرویانەوە (قەشە بیلیتوس)، وەئەم بۆچوونە هاوکار وهاوڕای زۆری هەبوون لە (فەلەستین و مەقدۆنیا و قوستەنتینیە)، تەنها کڵێسەی ئەسکەندەریە بوو دژیاتی ئەم بۆچونەی دەکرد..)).

لە کتێبی (تأریخ الأمة القبطیة ـ مێژووی گەلی قیبتی) دا هاتووە: ((قوستەنتین ئیمبراتۆری ڕۆمانیەکان کەوتە نێوان(قەشە ئەریوس) و(پەتریك[1] ئەسکەندەر)ەوە، کە پەتریکێکی گەورەی کڵێسەی ئەسکەندەریە بوو، داوای لێکردن کە پێکەوە دانیشن ویەککەون، بەڵام دەرنجام ڕێنەکەوتن، ئەمەش بووە هۆی بەستنی کۆڕی نیقیە لەساڵی٣٢٥ن)).

---

[1] پەتریك ـ البطرك: وشەیەکی یۆنانیە بە واتای باوکی باوکان دێت، بەڵام لەلای مەسیحیەت پلەیەکی خواپەرستیە نازناوە بۆ پێشەنگی گاوران، بنواڕە کتێبی: النصرانية وآدابها بين عرب الجاهلية: لويس شيخو :ل٨٦، وەرگێڕ.

کوڕی پەتریك کەمێژوو نووسێکی مەسیحییە[1] لە باسی ئەو کۆڕەو ژمارەی بەشداربوانی دەڵێت: ((قوسەنتین پاشای ڕۆمەکان ناردی بەشوێن پیاوەگەورەکانی کڵێسەکان لە هەموو وڵاتاندا، لە سەر ئەوداوایە (٢٠٤٨) پەتریك وقەشە کۆبونەوە، بەڵام ئەمانە هەڵگری ڕاو بۆچونی ئاییني جیاواز بوون، لەوانە:

١) بەربەرانیەکان:(پێشیان دەوترێ: مەریەمیەکان): ئەوانەن کەدەڵێن: عیسا ودایکی دو خوان جیاواز لە خودا (الله).

٢) سابیلۆس وشوێنکەوتوانی[2]ئەیانوت: نمونەی مەسیح وخودا وەك نمونەی مەشخەڵێکە کە لە مەشخەڵیکی ئاگر جیابوبێتەوە، بەشێوەیەك کەئەوەی یەکەم کەم و کورتی نەهێنا بە جیابوونەوەی دووەم.

٣) ئیلیان وشوێنکەوتوانی دەڵێن: مەریەم عیسای بە نۆمانگ لەسك هەڵنەگرتووە، بەڵکو هێندە لە سکیدا بووە وەك ئاو لە جۆگەلەیەکدا، چونکە ئەو وشەیەی - سروش - لە گوێیەوە چۆتە ژورێ و پاشان دەچێتە دەرێ ئاوها لەیەك کاتژمێردا منداڵەکەی بووە.

---

[1] سەعیدکوری پەتریك، یەکێك بوو لە پەتریکەکانی کڵێسەی ئەسکەندەریە خاوەنی کتێبی (نظم الجوهر)ە کە کتێبێکی مێژووییە باس لە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤ وپاشان ژیانی پێغەمبەران و پاشاو قەشە وپێشەنگەکانی ڕۆماو قوستەنتینیە دەکات، وەهەروەها باس لە تاقم ودەستەو تیپە جیاوازەکانی ئاییني گاوران دەکات، ئەم مێژوو نوسە لەساڵی (٣٢٨کۆچی بەرامبەر ساڵی ٩٤٠زاییني مردووە) وە زۆرێك لەزانا موسوڵمانەکان وتەو ڕای ئەم مێژوو نوسەیان وەرگرتووە لە کتێبەکانیان وە ئاماژەیان پێکردووە وەك ئیمامی قەرافی وئیبنو تەیمییە وئیبنو قەیمی جەوزی .. بنوارە: التخجیل من حرف التوراة والإنجیل:٢/١. وەرگێڕ.

[2] (سابلیوس) قەشەیەکی گاورە، سەرۆك و پێشەنگی تاقمێکە لە گاورەکان کە بەناوبانگ بوون بە ناوی (سابیلیەکان) لە ڕۆما ئەمەش لەسەردەمی (زفیرینوس) کە دەکاتە ساڵەکانی (١٩٨–٢١٧ز). بنوارە: تاریخ الکنیسة: ل٢٤٩، وەرگێڕ.

٤) پۆڵس ئەشمشاتی کەپەتریکێکی شاری ئەنتاکیا بوو (البولیفانیون) [1] پێیان وایە: کە مەسیح مرۆڤە دروست بووە لەخواوەند هەروەك ئێمە چۆن دروست بووین لەنەژادی خۆمان، وە سەرەتا کوڕی مەریم بووە، وەخودا هەڵی بژاردوە بۆ ئەوەی نەژادی مرۆڤایەتی پاك بکاتەوە.. بەو چەشنە نیعمەت و ڕۆزی خوای بەسەردا ڕژاو تێکەڵ بە خۆشەویستی و ویستی خودا بوو بۆیە پێی وترا کوڕی خودا، هەروەها ئەم تاقمە پێیان وایە کە خوا یەکە و لەکۆنە وەهەر بووە، وەباوەڕیان نیە نە بەوشەی خودا نە بە ڕۆحی پیرۆز.

٥) وەهەروەها مەرقیەکان پێیان وابوو: کە خودا لەوەتەی هەیە سێ بووە: خودای چاك وخودای خراپ و لەنێوانیاندا خودای دادپەروەر، وە شوێنکەوتوانی ئەم تاقم و گرۆهە پێیان وایە مەرقیون سەرۆکی قوتابیەکانی مەسیحە نەوەکو (بۆترۆس).

٦) شوێنکەوتوانی پۆڵسی پەیامبەر دەڵێن: مەسیح خودایە.

وە لە نێو کۆڕی نیقیەدا (٣١٨) قەشە وپاپاو پێشەنگەکانی گاور پشتیوانی ئەم بۆچونەیان کرد، وئەو ڕێژەیە گەورەترین ڕێژە بوو کە کۆبن لەسەر یەك بۆچون لە نێو ئەو (٢٠٤٨) قەشەیەی کە بەشداریان کردبوو، بۆیە (قوستەنتین) کاری بەو بۆچونە کرد، پاشان هەر (٣١٨) قەشەکەی کۆکردەوە وبەجیا پێیوتن: کاتی ئەوە هاتووە کە باوەڕ و شەرعی مەسیحیەت بنوسینەوە ودیاری بکەین تا

[1] ئیمامی ئیبنو قەییمی جەوزی دەڵێت: پەتریك (بولس الشمشاطي) یەکەم کەس بوو لە ئایینی مەسیحیەتدا داهێنانیکرد سەبارەت بە (المسيح اللاهوت والناسوت) واتە خوایەتی، وەیا: خوای بوونی عیسا، چون پێش ئەو هەموو مەسیحییەکان دەیانووت عیسا بەندە وپێغەمبەر و دروستکراوێکی خودایە، بەمەش ئایینی گاورانیان خراپ کرد وتێکدا... بنواڕە: هداية الحيارى في أجوبة اليهود والنصارى: ١٣٧/١، وەرگێڕ.

هەموو شوێنکەوتوانی پێکەوە گرێباتەوە، لەکۆتاییدا کۆڕی نیقیە بڕیارێکیان دەرکرد وەك خاوەنی کتێبی (تاريخ الأمة القبطية) بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەمەدەقی بڕیارەکەیە: ((کۆمکاری پیرۆز و کڵێسەی پەیامدارەکان بڕیاریاندا بە: قەدەغەکردنی (تحريم) هەموو وتەیەك کەبڵێ: کاتێ بووە کوڕی خودا نەبووە، وە پێش ئەوەی لەدایك بووبێ نەبووە، وە یا بووە لەهیچ بووە، یا بڵێ: کوڕی خوا لە مادە و گەوهەر دروست بووە جگە لە مادەو جەوهەری خودا، وەهەرکەسێ بڵێ: دروست کراوە، یا گۆڕانکاری بەسەردا دێت..)).

ئەم بڕیارە وچەندینی تر لە بیروباوەڕی پێشەنگە قەشەکانی کۆڕی نیقیە بەهۆی دەسەلاتی (قوستەنتین) سەپێندرا بەسەر شوێنکەوتوانی مەسیح، وهەرکەسێ پێچەوانەی ئەمەی بکردایە دەکەوتە ژێر نەفرینی قەشەو سوڵتانی ئەوکات، وەکو وتمان ئەمەی سەپاندیان تەنها ڕای (٣١٨) کەس بوو ، وەبەپێچەوانەوە نزیکەی (١٧٠٠) قەشە ڕایان لەگەڵ ئەم بیروباوەڕە نەبوو..

هەر لەو کاتەوە هەموو ئینجیل ونامە و جزم و کرداری نێراوان وەستێندران و لەکاریان خست جگە چوار ئینجیلی (مەتا، مەرقۆس، لۆقا، یۆحەنا) پاشان لەساڵی (٤٩٢ز) بەیەکجاری قەدەغەکران.

هەرچۆنێك بوو نوسخەیەك لە مزگێنی بەرنابا گەیشتە کتێبخانەی پاپاسەکتەسی پێنجەم (البابا سكتس الخامس) لە ڕۆما، پاشان یەکێ لە قەشە خواپەرستەکان بەنێوی (فرامرینو) دەیدۆزێتەوە[1] و دەیخوێنێتەوە، کەدەزانێ زانیاری باشی تێدایە

[1] ڕۆژهەلات ناس(سایل) دەلێت: دۆزەرەوەی نوسخەی ئینجیلی بەرنابا راهیبێکی گاوری لاتینی بوو بە ناوی (فرامرینۆ) پاش ئەوەی لەلای پاپای ڤاتیکان بەناوی (سکتسی پێنجەم) لای دەبات و لەلای خۆی هەڵی دەگرێت، پاشان دەبێتە موسوڵمان. بنواڕە: موسوعة الكتاب المقدس:٦١/٥. وەرگێر.

تێدایە وە دەگمەنە وە زۆرێك فەرمودەكانی دژی بیرو بۆچونەكانی گاورەكانە و زۆر لە یاساو بۆچونەكانی لە ئیسلامەوە نزیكە ئەو نوسخەیە دەبات لەگەڵ خۆی پاشان ئیسلامەتی خۆی ڕادەگەیەنێ..

ئەگەر ئەم ئینجیلە قەدەغە نەكرا بایە، موسڵمانانیش هێندە بێئاگا نەبانایە، وە كەمتەرخەمیان نەنواندایە، ئەوە بەس بوو بۆ ئەوەی كە ئەو ئینجیلەو ناوەڕۆكی بكەنە هۆكارێ بۆ گۆڕینی نێوەندی مەسیحیەت، بگرە بۆ گۆڕینی هەموو جیهان ...

ئەم ئینجیلە ئەوە ڕەت دەكاتەوە كە حەزرەتی عیسا لە خاچ درابێ، وە مژدەدەدات بەوەی ڕزگاركەری ئایندە (موحەمەد)ە، وەهاروەها خوایەتی مەسیحیش ڕەت دەكاتەوە. مزگێنی بەرنابا ئاماژە بەوە دەكات ودەڵێت: خەڵكی (یەسوع)واتە حەزرەتی عیسا دەخەنە پلەی خوایەتی لەكاتی ژیانی دا، بەهۆی ئەو موعجیزانەی كە لە سەردەستی ڕووی دەدا، كە لە كار و پیشەی مرۆڤ نەدەچوو، بەڵام مەسیح خۆی دەیگووت: ((من مرۆڤم لە ژنێك لەدایك بووم، ئەمنیش دەكەومە ژێر فەرمانی خودا، ئەژیم وەك سەرجەم مرۆڤەكان، دەكەومە ژێر نەگبەتی ولاساری گشتی..))[1].

سەبارەت بە خەتەنەكردن مزگێنی بەرنابا ئاماژە بەوەدەكا كە حەزرەتی عیسا حەرامی نەكردوە بەڵكە لەسەر ڕێرەوی موسایە..

بەڵێ: لەودەمی كە دەستكرا بە كۆكردنەوەو نوسینەوەی ئینجیلەكان زۆر شت ڕوویاندا، بەتایبەت لە ساڵانی سەرەتای زاینیدا و لەدوای تەواو بوونی بانگەوازی حەزرەتی مەسیح لە سەر زەوی، تا ئەو دەمەی كە گاورەكان ڕزگاریان بوو لە ئازارو ئەشكەنجە، كە نزیكەی سێ سەدەی خایاند سەرچاوە مەسیحیەكان تا

---

[1] مزگێنی بەرنابا بە وەرگێڕانی د. خەلیل سەعادە: ص٥.

ئێستا نەیانتوانیوە پشتاوپشتی نەبچراو پیشانبدەن لەسەر گێڕانەوەی ئینجیل، تەنها ئەو سەنەد وزنجیرەیەیان خستۆتە ڕوو وەجێی متمانەی خۆیانە کە دەگاتەوە ساڵی (٣١٣ز) کە یەکەم کۆڕو کۆبونەوە بەسترا لە دوای حەزرەتی مەسیح، بەڵام لەو مێژووە بەدواوە هیچ سەنەد وزنجیرەیەکی گێڕانەوە بەڕاست ودروستی ئینجیلەکان نیە وەئەوی ئاشکراشە لەلای هەموان حەزرەتی مەسیح نەخۆی ئینجلی نوسیوەتەوە وەنە بەسەر قوتابیەکانی خوێندویەتیەوە و پێی وتون تا بینوسنەوە، بەڵکو هەموو ئەوەی نوسراوە لە دوای نەمانی مەسیح بووە لەسەر زەوی.. ئەوەتا ئینجیل لەپێشەکیەکەیدا ئاماژە بەوەدەکات کە یەکەم زمان کە ئینجیلی پێ نوسراوەتەوە زمانی یۆنانییە، بەڵام ئاشکرایە کە زمانی فەرمی ئەو سەردەمی حەزرەتی مەسیحی تێدا دەژیا زمانی عیبری بووە، لە سەرو ئەمەشەوە حەزرەت ئەم زمانەی بەکار نەهێناوە لەکاتی بانگەوازەکەی، بەڵکو بە زمانی ئارامی دواوە، کە ئێستا زمانی سریانیەکان جێگەی گرتۆتەوە، وەهەروەها چەند سەرچاوەیەکیش ئاماژە بەوە دەکات کە قەشە مەتا ئینجیلەکەی بە زمانی عیبری نووسیوەتەوە..[1].

لێرەوە دەروازیەك بەڕوماندا دێ، دەبێ ناچار بەنێویدا بڕۆین، ئەویش ئەو فەلسەفەو بیرو بۆچونانەیە کە لە سەردەمی نوسینەوەی ئینجیلەکاندا باو وبەربڵاو بووە، بێگومان فەلسەفەی یۆنانیەکانە کەسەرچاوەی لە بیرمەندی (ئیفلاتون)ەوە وەرگرتبوو، کەباس لە جیهانی نمونەیی بەرز دەکا، واتە تامەزرۆ بوون بەرەو وێنەیەکی تەواوی بەرزی خواوەند، ئەوەش پێی دەوترێ (الهیولی) ئەم فەلسەفەیەش زۆرشتی جوداو جیاوازی لێوە هەڵ هێنجرا..

[1] بنواڕە: محاضرات في النصرانية، سەرچاوەی پێشوو: ل٤٦.

فەیلەسوفە بیرمەندە یۆنانیەکانی وەکو (سوقرات وئیفلاتوون وئەرستۆ) پێیان وابوو ئەو دەسپێکەی کەجیهانی لێکەوتۆتەوە خودایە، وەئەمیش بەرەو کەماڵی گۆڕاو دەچێت، وەخوداش بە بیری ئەوان دوو هۆکاری داناوە بۆ گەیشتن بەو ژیانە نمونەییە، ئەویش بریتین لە: ژیری و گیان (العقل والروح)، چون ژیری و ڕۆح لە خوداوە سەرچاوەی وەرگرتووە، بەواتایەکی تر ئەو دووە لەوداهەن و لەویشەوە دەردەچن، دەکرێ بۆچونی فەلسەفەی یۆنانی بەتایبەت فەلسەفەی ئیفلاتوون سەبارەت بە ناساندنی خواد وبوونی وەها لێك بدەینەوە (خودا، لەویشەوە ژیری، پاشان گیان) .

سەرنج بدە کە چۆن ڕۆژهەڵات ناسی ناسراو بە (لیۆن جوتیە) پەیوەندی نێوان فەلسەفە وبیرو باوەڕی مەسیحی دەردەخات ودەڵێت: ئەو ڕێڕەوو باوەڕەی کە دەرنجامی عەقڵی ئیفلاتونە ـ ئەگەر چی تێگەیشتن وپەیپێبردن تێیدا جۆرێ لە ئاڵۆزی تێدایە بەڵام دەرئەنجام هەمان بیر وباوەڕی سێ کوچکەی خوایەتیە باناوبانگەکەی گاورە، وە زۆر بە ئاسانی مەبەست لەمە دەردەکەوێ، لەوانە: پاراستنی کامڵیەتی ڕەهای خودا ودورکەوتنەوە لە گۆڕان بە سەریدا، ئەمەش وای کردووە کە لە نێوان خۆی و جیهاندا دوو هۆکار لەبری خۆی، بەدەر لەخۆی دابنێت، بەشێوەیەك بەشێکیش لە نێوەڕۆکی خودا بێت وەلەوەوە وەدەرکەوتووە، بەڵام لە خودا لەخوار ترە لە پلەی کەماڵ وتەواویدا، ئەمەش وایکردووە لە خوداوە جیهانێکی زۆری گۆڕاو وەدەرکەوێ، یەکەمی ئەو دوو هۆکارە: عەقڵە، دوومیان: ڕۆحی خواوەندانەیە.

(جۆتیە) برگەیەکی تر دەردەخاو دەڵێت: خواوەندیەتی مەسیحیەت وەرگیراوی ئەم فەلسەفەیە، بۆیە دەبینین لە نێوانیاندا (واتە: نێوان خواوەندیەتی مەسیحیەت

وفەلسەفەی ئیفلاتۆنی نویَ) لێکچواندنێکی زۆر و گەورە هەیە، گەر چی لە هەندێ وردەکاری، بەڵام هەردولا جەخت لە بیری سێیەتی (التثلیث) یا سێ خواوەندی دەکەن، یەکەمی ئەو سێیە سەرچاوەی هەموو کاملّییەکە، لە نێویشیدا هەموو کاملّیەك بەدی دێت، ئەمەیە مەسیحیەکان پێی دەڵێن: (الأب ـ باوك ـ خودا) دووەم (الابن ـ ڕۆڵە ـ مەسیح) وەپێشی دەوترێ: (الكلمة ـ وشە ـ سروش) لێردا مەبەست لەوشەی کوڕ لە جێی لەدایك بوو هاتووە، وسێیەمیان: (الروح القدس ـ گیانی پیرۆز ـ ڕۆحی ڕەوان)..[1].

مامۆستا (موحەمەد عەلی قوتب) لەم بارەیەوە هەڵوێستەیەکی جوانی هەیە، لە کتێبی (نظرات في إنجيل برنابا ـ چەند تێڕوانینێك لەمەڕ مزگێنی بەرنابا) دەڵێت: ((ئێمە کاتێ لێکۆڵینەوەو توێژینەوە دەکەین لەم بابەتە، دەستبەجێ مۆرکی دروست و نادروستی نابەخشینەوە، وەکی غەیر ئێمە وەها دەکەن[2]، بەڵکە ئێمە لە

---

[1] بنواڕە: دراسة الفلسفة الاسلامية ـ ليون جوتيه : ص٧٣، ٧٤، ٩٢، ٩٤، طبعة باريس١٩٢٣م.

[2] مامۆستا موحەمەد عەلی قوتب ئاماژە بەو دوو دڵیە دەکات کە کەوتۆتە نێوان مەسیحیەکانەوە لەسەر ڕاستی وناڕاستی ئینجیلی بەرنابا، چون هەندێ پێیان وایە ئەم ئینجیلە لە سەدەی شازدەهەمدا دروست کراوە وهەڵبەسراوە، بەڵام سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: پاپا (جلاسیەسی یەکەم) لەساڵی (٤٩٢ز)دا زۆرێك لە مزگێنیەکانی ڕەت کردەوە و قەدەغەی کرد، وەناوی ئەوانە بە ئاشکرا هاتوون وەك مزگێنی ئەلئەغنەسیتی، ومزگێنی بەرنابا، وەچەندەهای تر کەپێشتر باسمان لێوەکرد، هەروەها چەند نامەو جزم وکتێبی تر هەبوون ئەوانیش بەهەمان دەردا چوون، لەوانە جزمی ئەخنون ونامەی (ئەریانۆس)، ئەو نامەی کە بووە هۆکاری یەکەم لەلای قەشە((فرامرینو) بۆئەوەی دەست بکا بە گەڕان و پشکنین بە دوی مزگێنی بەرنابادا، چون لە نێوەڕۆکی ئەو نامەیەدا هاتووە ئەریانۆس ڕەخنە لە پۆڵسی نێراو دەگرێت وەستایشی مزگێنی بەرنابا دەدات، ئەمەش (فرامرینو)ی هاندا زیاتر بەدوایدا بگەڕێ، تا ئەوەبوو لەلای پاپای ڕۆما (سکتسی پێنجەم) بینیەوە، وپاش ئەوەی کە پاپا چاو لێکدەنێت و خەو دەیباتەوە، ئینجیلەکە دەخاتە بن باخەڵی دەیباتە لای خۆی، پاشان بەهۆیەوە موسوڵمان دەبێت..

گۆشه نیگایەکی تەواو بابەتیانه دەڕوانین تا ڕاستیەکان ئاشکرابیێ ....بەڵێ تەنها ڕاستیەکان...)) دوودڵی بەرامبەر بوونی بیروباوەڕە مەسیحیەکان ڕەگ وریشاڵی لەمێژەوە لەمێژوودا هەیە ، لەهەمان کتێبدا مامۆستا قوتب دەڵێت: ئەوەی سەیرە ـ خوێنەری ئازیز ـ مێژووی کڵێسە پڕە لە کۆڕ و کۆبونەوەی ئایینی کە پێیدەوترێ (مجامیع ـ کۆڕگەکان) کەدەبەستران بۆ لێکۆڵینەوەو یەکلا کردنەوەی بیروباوەڕی گاورەکان !

لەو سەردەمەی حەزرەتی عیسا لەسەر زەوی ولەنێو جولەکەکانە وگاورەکان دەژیا کاردانەوەی گومان بەردەوامە و پەیوەستە بەدڵ و ڕۆح و ژیری گاورەکانەوە تا ساڵی (٨٦٩ز) کاتێ کۆڕی هەشتەم بەسترا کە پێیدەوترا کۆڕی (القسطنطينية الرابع ـ قوستەنتینی چوارەم) ئەگەر وردبینەوە لە هۆکاری بەستنی ئەو کۆنگرەیە بۆمان دەر ئەکەوێ کەچۆن گومان چواردەوری بیرو باوەڕی گاورەکانی داوە بەشێوەیەك کەبیرو باوەڕی خەڵکی بۆخۆی بڕیاری لێدەدا.. ئای چەندە سەیرە ! ! پەتریکی قوستەنتینیە (فوسیوس) پێی وایە کە (الروح القدس ـ گیانی پیرۆز ـ ڕۆحی ڕەوان) تەنها لە (الأب ـ باوك ـ خودا) هاتووە و هەڵقوڵاوە، بەڵام پەتریکی ڕۆما پێی وایە ڕۆحی ڕەوان هەڵقوڵاوەلە (الأب ـ باوك ـ خودا) وەهەروەها لە (الابن ـ کوڕ ـ مەسیح)، لەسەر ئەم بۆچونەش شەڕو مشتومڕێکی گەورە کەوتەوە، دەرئەنجام پەتریکی قوستەنتینیە پەراوێز خرا و پەتریکێکی تر لەشوێنیدا داندرا، تا ساڵی (٨٦٩ز) کۆڕێك لە قوستەنتین بەسرا بەناوی (المجمع الغربی اللاتینی ـ کۆڕی ڕۆژئاوای لاتینی) بۆ مەبەستی چاوپیاخشانەوە لە بەرپابوونی (ڕۆحی ڕەوان ـ الروح القدس) ئایا لەبابە یاله ڕۆڵە؟!

لەدوای دەساڵ، واتە لەساڵی (٨٧٩ز) پەتریك (فوسیوس) توانی بێتەوە پلەکەی خۆی ببێتەوە بەپەتریکی قوستەنتین، وە لە سەر بۆچونەکەی مایەوە، وە گاورەکان تا ئیمڕۆش لەسەر بۆچونی ئەون.. وەئەمەش بووە هۆی جیابونەوەی کڵێسەی ڕۆژهەڵات (الأرثوذوكسية) وە کڵێسەی ڕۆژئاوا (الكاثوليكية) وە قسەکردن لەسەر ئەو بیروڕایە دواخرا..

شێخ ڕەحمەتوڵا لە کتێبی (إظهار الحق - دەرخستنی ڕاستی) دەڵێت: ((زۆرجار داوامان دەکرد لە زانا بەرز وناودارەکانیان کە زنجیرەی پشتاوپشتی گێڕاوەکانی مەسیحیمان پێ بڵێن، نەیاندەتوانی وەڵاممان بدەنەوە.. وپۆزشیان دەهێنایەوە لەوکاتەی کەلە مەحفەلەکاندا مێزگردمان لەگەڵیاندا سازدەکرد. وەهەندێ جار ئەوەیان دەکردە بیانو لەسەر نەمانی زنجیرەی بە یەکگەیشتووی گێڕاوەکانیان کە ئاوا لەنێوچون بەهۆی ئەو ئاشوب و ناڕەحەتیانەی بەسەر مەسیحیەتدا هات کەنزیکەی (٣١٣) ساڵی خایەند، زۆر لە نوسراوەکانیانمان پشکنین جگە گومان هیچی ترمان نەبینیوەتەوە، ئەوان کار بە گومان و گریمانە دەکەن، گومانیش لێرەدا و لە بیرو باوەڕدا کاری پێناکرێ))

بەڵێ: ئێمە باوەڕمان وایە ئەو گێڕانەوانەی مەسیحیەت بەدوور نەبوون لەفێڵ و قینی جولەکەکان، چون ئەوان زۆرترین کەس بوون کەخۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی لە ئازارو ئەشکەنجەی گاورەکان، وە ئەوان زۆرترین کەس بوون کە دەیانویست ئینجیل بێ ناوەڕۆك و بێ سوود بمێنێتەوە... (سیجمۆند فرۆید) - زانایەکی دەروونناسە و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە - وەیەکێکە لەو جولەکە قین لەدڵانەی کە بەئاشکرا دژایەتی مەسیحیەتیان دەکرد، لە کتێبی (موسى والتوحيد - موسا ویەکتاپەرستی)دا دەڵێت: ئایینی مەسیحیەت پڕاوپڕ ئاینێکی یەکتاپەرستی نەبووە،

لەو گەلانەی کە لەم ئایینەوە نزیك بووە زۆرێك لە هێما وداب ونەریتی تری تێکەڵ بووە، لەوەش زیاتر گاورەکان نەبوونە ڕێگر لە بەردەم ئەو هەموو تێخزانە ئەفسانەیی وجادوە پروپووچانە کەنەیەتە ئایینەکەیانەوە.. وەئەمەش بووە ڕێگرێکی گەورە لەبەردەم گەشەسەندنی ڕۆحی ئەم ئایینە لەماوەی دوو هەزار ساڵی تەمەنیدا ..[1].

ئێمە دەزانیین بۆچی فرۆید ئەم قسانە دەکات چۆن دەیەوێ ئامانجی خۆی بپێکێ ودەریخا کە هەموو ئایینێ دەستکاری کراوە، وە بۆ ئەوەی پەردەپۆشی ئەوە بکا کە بەسەر ئایینی جولەکەکاندا هاتووە لە ڕوانگەی دستکاری و گۆڕانکارییەوە.. بەهەرحال ئەوەی مەبەستمانە لە نەقڵی قسەی ئەو، دەربڕینێکی ئاشکرای جولەکەیەکی دیار وبەناوبانگە..لەسەر دەسکاریکردن وتێکەڵ بوونی شتی پرو پوچ لەئایینی مەسیحیەت.

زۆرێ لەزانیاریەکان ئەوە دەردەخەن کە نوسخەیەکی دووەم لە ئینجیلی بەرنابا بەزمانی ئیسپانی دەرکەوتوە دۆزراوەتەوە لە ساڵی (١٧٨٤ز) بەڵام دواجار لەنێوچووە، وە ئەو نوسخەیە وەرگێراوی هەمان نوسخەیە کە بەئیتالی نوسراوەتەوە..[2].

بەڵام نوسخەی ئەصلی کەپێشتر ئامارژەمان پێکرد، لە کتێبخانەی پاپا(سکتسی پێنجەم) پارێزراو بوو، وە لە سەدەی شازدەهەمدا لەڕێی قەشەی لەخوا ترس (فرامرینو) براو لەلای مایەوە، پاشان لە کتێبخانەی یەکێك لە ناودارەکانی شاری (ئەمستردام) پارێزاروە، وە لە ساڵی (١٧٠٩ز)دا بەدیاری بەخشرایە ڕاوێژکاری پادشای ڕوسیا، وە لەساڵی (١٧١٣ز) وەك دیاری بەخشرایە کەسێ بەناوی (البرنس أوجيني سافوری) کە زۆر تامەزرۆی کۆکردنەوەی کەلەپور و دەستخەت و پاشماوەی مێژوویی بوو، پاشان ئەو

---

[1] بنوارە: موسى والتوحيد، سيجموند فرويد ص١٨٢، هەروەها بڕوانە کتێبی (اليهودية) هەمان نوسەر.

[2] بنوارە : بيولوجيا الإيمان، د. محمود عبدالقادر:ص٦٢.

نوسخەیە و سەرجەم کتێبخانەکەی (البرنس)[1]برایە کتێبخانەی کۆشکی شایانە لە شاری (ڤیەننا) وە تا ئێستاش ئەو نوسخەیەی مزگێنی بەرنابا لەوێ پارێزراوە[2].

ئەو نوسخەیە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی لەلایەن ڕۆژهەلات ناس (سایل) و دکتۆر (منکهوس) کەیەکێکە لە ئەندامانی کۆلێژی پادشایەتی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، لە دەسپێکی وەرگێڕانەکەیدا سایل دەڵێت: ((دۆزەرەوەی ئەم نوسخەیەی مزگێنی بەرنابا بەزمانی ئیتالی کە قەشەیەکی لاتینی بوو بەنێوی (فرامرینو)، وە ئەو بەباشی و بەقوڵی لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەم ئینجیلە کرد، بۆیە بەهۆیەوە ئیسلامی وەرگرت وبووە موسوڵمان))[3].

ئێمەش لەم کتێبەدا بەشێك لەناوەڕۆکی (مزگێنی بەرنابا)ی قەدەغەکراو دەخەینە ڕوو، پاش ئەوەی بەشێوەیەکی کورت باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی عیسا دەهێنین لە ڕوانگەی ئیسلام، وەهەروەها لە ڕوانگەی ئینجیلی باوەڕ پێکراوی ئەمڕۆی گاورەکان، وە لەنێو ئەو چوار ئینجیلەشدا (مزگێنی مەتا) هەڵدەبژێرین لەگەڵ ئەوەشا خوێنەر بەئاگا دەهێنینەوە کە ئەوەی ڕاست ودروست بێ لە چیرۆکی حەزرەتی عیسا ئەوەیە کە لە ئایینی ئیسلامدا باسی کراوە، بەڵام وەك بەراوردێ لێرەدا باسی دەهێنین، پاشان ژیان و بەسەرهاتی عیسا چۆن هاتبێ لە مزگێنی مەتا یا مزگێنی بەرنابا، ئەوە وەك خۆی ئاماژەی پێدەکەین ..ڕای ئیسلامی لەسەر ناهێنین، چون مەبەست بەراوردێکە لە نێوانیاندا..

ئەوەی مەبەستمانە تەنها دەرخستنی ڕاستیەکانە بەبێ لایەنگری، وە ئەوەش بزانین هاتنی هەموو ئایینەکان بۆ خۆشبەختی و خێرو چاکەی مرۆڤایەتیە.. وەهەروەها ئەمەی

---

[1] وشەی (البرنس) لەبنچینەدا بە کراسێکی درێژ دەوترێ کە کڵاوی بەخۆیەوە دوراوە، ئەمەش پیاوانی لەخواترسی گاورەکان دەیان پۆشی .. بنواڕە: کتێبی: تاج العروس:١٠٨٧/٤.وەرگێڕ.

[2] بنواڕە: مقارنة الأديان. د. أحمد شلبي: ص٢٠١.

[3] بنواڕە: بيولوجيا الايمان : سەرچاوەی پێشوو.

باسمان كردووه له دووتوێی ئەم كتێبەدا تەنها بەشێكی بابەتەكەیه وه پێویستی بەوەهەیه كه كەسانێكی تر زیاتر لێكۆڵینەوەی لەسەر بكەن.. وه ئەم كاره هەنگاوێكه بۆ گەیشتن بەئامانجی ڕاست ودروست وحەق.. داواكارین له خودا سەركەوتومان بكا لەو ڕێیەدا ...

************

## کورتەیەك لەچیرۆکی مەسیح لە قورئاندا

## باس وگێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەر عیسا (سلاوی خودای لێبێت) بەوچەشنەی کە لە ئایینی ئیسلامدا هاتووە.

خێزانی عیمران کە دایکی مەریەمە لەکاتی دوو گیانی بە خاتوو مەریەمەوە دەڵێت: ﴿إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾[1]، واتە[2]: ((خێزانی عیمران گوتی: ئەی پەروەردگارم ئەو کۆرپەیە وا لەسکمدا (دەقەبەڵی) نەزری تۆی دەکەم، تۆش لێم وەربگرە، هەرخۆت بیسەر و ئاگاداری*کاتێ منداڵەکەی بوو، وتی خودایە ئەمن کچم بوو، وەتۆش ئاگادارتری بەوەی بووە، تۆش دەزانی کوڕ وەك کچ نیە، وەمن ناوم نا مەریەم، ئەوا خۆی ونەوەی ئەوم بە تۆ سپارد لەشەیتانی نەفرەت لێکراو* پەروەردگاری ئەو نەزرەی قبوڵ کرد بەباشترین شێوە، گەشەی پێکرد گەشەیەکی باش وچاك ـ دایکی هێنای بۆلای خواترس و قەشەکانی ماڵی پیرۆز (بيت المقدس) پێی گوتن ئەوە کۆرپە

---

[1] سورة آل عمران: الآية ٣٥ـ ٣٧.

[2] ئەم ڕاڤە کوردیە بێگومان لە دەقە عەرەبیەکەدا نییە، چون دانەر تەنها دەقە قورئانیەکەی هێناوە بەبێ لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی، بەڵام بەباشم زانی بەشێوەیەکی کورت وپوخت ڕاڤەی بکەم، تا خوێنەری کورد زیاتر ئاشنای واتا ومانای دەقە قورئانیەکە ببێ وپێویست نەکا بگەڕێتەوە بۆ تەفسیرەکەی ..وەرگێڕ.

نەزکراوەکەمە بەقوربانە ئاگاتان لێبێت، ئیدی هەموو بەتەمابوون کە لەخۆیگرن وسەرپەرشتی وبەخێوی بکەن، لە وێدا زەکەریا وتی من لەپێشترم بەم کارە چون پوری ئەو خێزانی منە - ئیدی زەکەریا لەخۆیگرت خستیە ئەستۆی خۆی، هەمووکات کەدەچوو سەری لێ بدا بۆ میحراوەکە دەیبینی بژێوی (خواردن و خواردنەوە)ی لەلایە، گوتی: ئەی مەریەم ئەمەت لەکوێ بوو؟ گوتی لەلایەن خوداوە بۆم هاتووە، بەدڵنیایەوە خودا بژێوی بێ هەژمار دەنێرێ بۆ هەرکێ ویستی لێ بێ))[1].

دایکی مەریەم (سلاوی خوای لێبێت) کاری بە نەزرەکەی کرد، هێنای پێشکەشی پەرستگا کەی کرد، لە نێو خواناسەکانی ئەو پەرستگایەدا پیاوێکی لەخواترس بەناوی زەکەریا کەپێغەمبەری خودا بوو لەخۆی گرت وە لەسایەی ئەودا پەروەردەبوو وەگەشەی کرد، لێرەدا ئەوە تێبینی دەکەین ئەم خاتوونە لەماڵێ لەماڵەکانی خودادا وە لە لای پێغەمبەر وخواناسترین کەسی ئەو دەمە گەورە بوو و بەخێو کرا دووبارە تێبینی ئەوەدەکەین کە خودای شارەزا نەزرەکەی دایکی مەریەمی قبوڵکرد، لەسەر ئەو نیازەپاکەی کەویستی وابوو ئەگەر کوڕی ببێ پێشکەشی بکات بۆ خودا، بەڵام لە ڕێی (مەریەم)ەوە ئەو کوڕە پێغەمبەرە لەدایك بوو، ئەو کوڕەی کە بووە یەکێ لە پێغەمبەرە دیار و خاوەن عەزم و بەرێزانەی خودا، ئەو پێغەمبەرە لە داوێنی ئەو خاتونە خواناسە پاکەوە لەدایك بوو بەبێ ئەوەی دەستی لە هیچ پیاوێ بکەوێ بەبێ باوك وەك نیشانەو بەڵگەیەکی خودایی

---

[1] بنوارە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل٥٤، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی نظام الدين عبدالحميد:١/١٢٩، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي:٢/٦٥، تفسير الجلالين: للمحلي والسيوطي:ص٥٤، وەرگێر.

هاته بوون.. بەلام جولەکەکانی ئەو دەمە کەوتنە بوختان و هەڵبەستنی قسەو قسەلۆك، تا تۆمەتباریان کرد بەداوێن پیسی، ئەوەش یەکێ بوو لە هۆکارەکان کەبووە هۆی کۆچ کردنی لەگەڵ کۆرپەکەی ـ حەزرەتی عیسا ـ بەرەو ولاتی میسر، دیارە پاڵێنەری سەرەکی بۆ ئەو کۆچە لە (بيت لحم)ە وە بۆ میسر ئەوە بوو ـ وەك هەندێ مێژوو نوسان دەڵێن ـ کە هەندێ لە پێشبینی کەران و جادوبازان بە پادشای ولاتی (شام)یان وتبوو کە پێغەمبەرێ لەدایك دەبێ وەك پێغەمبەر موسا، خەڵکی هەموو شوێنی دەکەون و ئەو پاشایەتیە لەدەست دەدەی بەهۆیەوە، بۆیە پاشا بەڵێنی دا گەر بیدۆزێتەوە دەست بەجێ بیکوژێ، ئەمە بووە هۆی ئەوە کە خاتوو مەریەم لەگەڵ منالە شیرەخۆرەکەیدا و بەهاورێیەتی یوسفی دارتاش[1] (کەدەستگیرانی پێشووی مەریەم و باوە پیارەی عیسا بوو)[2] لە میسر چەند مانگێ مانەوە تا ئەودەمی کە یوسفی دارتاش هەواڵی پێگەیشت کە (هیرودس ـ پاشای شام) مرد، ئیدی گەڕانەوە بۆ فەلەستین بە شاری (الجليل) پاشان چونە شاری (الناصره) لە وێ مانەوە، لەم رووەشەوەیە هەندێ جار بە حەزرەتی عیسا دەڵێن : عیسای جەلیلی یا عیسای ناصری ..

---

[1] يوسف النجار (یوسفی دارتاش) وەك زانایان دەڵێن: لاوێکی خواناس بووە، کوڕی خاڵی مەریەم بووە، دەستگیرانی مەریەم بووە پێش ئەوەی مەریەم ببێتە دوگیان، بەلام کاتێ یوسف بینبویەتی کە ئەمەوەك موعجیزەیەك بووە، لەگەڵی ماوەتەوە پاشان مەریەمی خواستووە، بنوارە: الجامع لأحكام القرآن للقرطبي:٨/٦. وەرگێڕ.

[2] پێش ئەوەی وەحی دابەزێ بۆ سەر مەریەم پێی بڵێ منالێکی زیرەکت دەبێ بەبێ باوك ، مەریەم دەستگیرانی یوسفی دارتاش بوو ـ وە لەوکاتەدا یوسف خەو دەبینێت لەخەویدا مەریەم سکی پڕ بووە بە یەسوع ئەو پێغەمبەرەی کە بەڵێن وایە بێت لە نەوەی ئیسرائیل، بۆیە بڕیاریدا تا ماوە خزمەتکاریان بێت..

پاش ئەوەی خوای گەورە فەرمانی دا بە حەزرەتی عیسا کە دەست بکات بەبانگەواز، ئیدی عیسای کوڕی مەریەم (سڵاوی خوای لێبێت) کەوتە بانگەواز بە ئامۆژگاری بە مژدەدان وئاگاداری، وەبانگەوازی مەسیح هێندەی بانگەوازی یاسا دانان نەبوو بەوئەندازەی کە ئاگاداری بەئاگابوونەوە بوو لە چەوتی و خراپەی جولەکەکان وئەو دەستکاری ولادانەی ئەوان بەسەر ئاین و پەیامی حەزرەتی موسایان هێنابوو، بۆیە هەموو جارێ خۆی دەیگووت: ئەوەی موسا هێنای لەپێشدا وئەوەی من هێناومە لە یەك سەرچاوە و سروشەوەیە.

حەزرەتی عیسا لەکاتی بانگەوازەکەیدا بۆ خەڵکی ڕوون دەکردەوە کە ئەو نێراوێکی خودایە وەئەوەی لەسەردەستی ڕوودەدات وەك موعجیزەی پێغەمبەرایەتیە، وەك زیندوکردنەوەی مردوو، چارەسەری نەخۆشیەکانی گولی وبەڵەکی و کوێری... هەموو ئەمانەی بە فەرمان و ویستی خوا چاك دەکردەوە، ئەمەش وای لەهەندێ کەس کرد کە بیکەنە خودا چون ئەو کارانە لەسەر و توانای مرۆڤەوەیە، وە هەروەها خۆی دەناساند و دەیوت: مرۆڤم وەکو ئێوە نان دەخۆم وەك ئێوە توشی ناخۆشی دەبم ئیدی چ خوایەکم؟! لەم بارەیەشەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾﴾[1].واتە: ((لەبری خودای تاك وتەنها (مەلاکانی جولەکەو و ڕەبەنەکانی گاور و مەسیحی کوڕی مەریەمیان) کردە خودا دەیانپەرستن، فەرمانیشیان پێکرابوو کە تەنها

(1) سورة التوبة: الآية٣١.

بەندایەتی خودای تاکو تەنها بکەن، هیچ خودایەك شیاوی پەرستن نیە جگە ئەوخوایە، بێخەوشی بۆ خودا لەوشتانەی بەهاوتای ئەوی دەزانن))[1].

پێشتر لە پێشەکی دووەم ئاماژەمان بەوەدا کە لە مزگێنی بەرنابادا لەم بارەیەوە چی هاتووە..

ئەوەی مەبەستە لێرەدا باسی لێ بکەین ئەوەیە کە ئەو موعجیزانەی حەزرەتی مەسیح، ئەبوو وابوایە چون لەو سەردەمەدا پزیشکی لە لوتکەدا بوو، زۆر لەپێشدا بوو، بۆیە دەبوو موعجیزەکانی لە چارەسەری نەخۆشی سادەو ئاسایی زیاتر بێت، هەروەك چۆن لە سەردەمی حەزرەتی موسادا هەموو وڵات ببو بە کاری سحر وجادو وەسحربازی گەیشتبووە لوتکە، خوای گورە لە هاوشێوەی سحرەکانیان موعجیزەی بەخشیە حەزرەتی موسا، ئەوەش بوو کەساحرەکان یەکەم کەس بوون کە باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی ئەو هێنا.. وەهەروەها لە سەردەمی پێغەمبەری ئازیزمان موحەمەد (درودی خوای لێبێت) ڕەوانبێژی کار وباوی ئەو سەردەمە بوو، هەموو بەوەوە خەریك بوون، سەرۆك هۆزێ یا سەرکردەیە یا هەر شێوەیە لە ناودارانی کۆمەڵگەی ئەو دەمە ئەو پلەیەی چنگ نەدەکەوت گەر یەکێ لەو ڕەوانبێژ تر بوایە، هەموانیش دەزانین هەگبەی مێژوو چەندەها نمونەی ڕەوانبێژی لە شێوەی شیعردا بۆی تۆمار کردوین، کە هەموو لە شارەزا و زانا، لە نەفام وبێ ئاگا، دان دەنێن بە گەورەیی داڕشتنی ئەو شیعرانە لە ڕوونی وشەو پاراوی ڕستەو جوانی ماناو بەهێزی هەست و سۆز لە نێویاندا تا وەهای لێهات لەسەر دەمی نەفامیدا ئەو شیعرانە بە ئاوی ئاڵتون نوسرایەوەو لە دیواری ماڵی خودا (کابە ـ كعبة)

---

[1] بنواڕە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل١٩١، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی نظام الدین عبدالحمید:١/٤٧٣، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي:٨/١١٩، تفسير الجلالين:ص١٩١، وەرگێڕ.

هەڵدەواسرا، مەگەر ئەمە لوتکەی ڕەوانبێژی دەرناخا، ئا لەم کاتدا قورئان دابەزی، بووە بەرەنگاریەکی گەورە کرد، لەم بارەیەشەوەخودای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾[١]. واتە: ((پێیان بێژە ئەی موحەمەد، ئەگەر مرۆڤەکان و جنۆکەکان کۆببنەوە، بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن لە ڕەوانبێژی وپاراویدا، ئەوە ناتوانن نمونەی بهێنن، ئەگەر هەمووشیان ببنە پشتوانی یەکتر لەم کارەدا))[٢]، وهەروها دەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾[٣]. واتە: ((بێ باوەڕان دەڵێن ـ موحەمەد ڕاست ناکا کە ئەم قورئانە لەلای خوداوە هاتووە بەڵکو ـ خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە، تۆش ئەی موحەمەد پێیان بڵێ: دەی ئێوە تاکە سورەتێ لە وێنەی ئەو قورئانە بهێنن ، بە خۆتان وەهەرکەسێکی تر جگە خودا، گەر ئێوە ڕاست دەکەن))[٤].

ئەم بەرەنگاریە تەنها بۆ ئەو شوێن و ئەو دەمە نەبوو، بەڵکە بەردەوامە تا دواڕۆژی ئەم دونیایە ئەمەش گەورەیی وتوانای خوایەتی دەچەسپێنێ..

جا بزانە قورئان تەنها بەرەنگاری بەرپا ناکا لە ڕووانگەی ڕەوانبێژی و بەس، بەڵکە بە ڕۆحی دانایی وهەمەلایەنە بوونی شەریعەتەکەی کە بەڕاستی مافی خۆیەتی بۆتە کۆتا پەیامی ئاسمانی.. وەسەرچاوە مێژووییەکان دڵنیامان دەکەنەوە کە لە

---

[١] سورة الاسراء الآية٨٨.

[٢] بنوارە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل٢٩١، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی: نظام الدین عبدالحمید:٧٢٧/١، الجامع لأحکام القرآن للقرطبي:٣٢٧/١٠، تفسیر الجلالین:ص٢٩١. وەرگێڕ.

[٣] سورة یونس: الآیة٣٨.

[٤] بنوارە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل٢١٣، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی: نظام الدین عبدالحمید:٥٢٥/١، الجامع لأحکام القرآن للقرطبي: ٣٤٤/٨، تفسیر الجلالین:ص٢١٣. وەرگێڕ.

هاتنی دوا پایەمی ئاسمانی قورئان ودوا پێغەمبەری خودا موحەمەد هیچ پەیام وکەسێکی تر نەهاتووە تا ئەمڕۆ ..

جولەکەکان دەڵێن: وەك لە (تەورات)ەکەیان هاتووەکە (العهد ـ پەیمان ـ واتە پێغەمبەری بەڵێن پێدراو) ئەو کەسەیە کە لە نەوەی سەربڕاوەکەیە وەدەشڵێن لە نەوەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە (سڵاوی خوایان لێبێت) لە (سارا)ی خێزانی، بەڵام موسوڵمانان دەڵێن: لە نەوەی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە لە (هاجەرە)ی خێزانی، وەبەڵگەی موسوڵمانەکان بەهێزترە چون تەنها لە سەرچاوەکانی ئیسلامەوە بەڵگە ناهێننەوە، بەڵکە لە نێو (تەورات)یشدا ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێ، ئەوەتا لە (نوسراوی دروست بوون ـ سفر التكوين) لە بەشی بیست ودوودا هاتووە و دەڵێت: ((لەدوای ئەوە خودا ئیبراهیمی تاقیکردەوە، بانگی کرد ئەی ئیبراهیم، وەڵامی دایەوە و وتی فەرموو ئامادەم، خوا پێی فەرموو: بڕۆ کوڕە تاقانەکەت بەرە ئیسحاق ... پاشان ئیبراهیم ئیسحاقی بەستەوە تا سەری ببڕێ..)) لێرەدا سەرنج بدەین دەبینین دەڵێت: (کوڕە تاقانەکەت) واتە: کاتێ خودا فەرمانی بە ئیبراهیم کرد تەنها یەك کوڕی هەبوو، کەوا بوو ئیسحاق نییە بەڵکو ئیسماعیلە، چون ئیسماعیل پێش لەدایکبوونی ئیسحاق بەچواردەساڵ لەدایك بووە هەر لە (تەورات)دا لە بەشی بیست ویەکەمدا لە باسی فریشتەی خودا قسە لەگەڵ (هاجرە) دەکات، هاتووە دەڵێت: ((هەستە، هەڵیگرە، کۆرپەکەت ئیسماعیل، وە زۆر ئاگاداری بە چون ئەمن لە نەوەی وی نەتەوەیەکی گەورە دەهێنمە بوون)) بێگومان مەبەست لە نەتەوەی گەورە نەتەوەی ئیسلامە[1].

---

[1] بنواڕە: کتێبی (تەوراتەکەیان) هی دانەری ئەم کتێبەیە.

بەڵێ: هەموو کتێبە ئاسمانیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە پێغەمبەری داهاتوو ـ کە بەڵێن وایە بێت ـ لەدوای حەزرەتی عیسا موحەمەدە (دروودی خوای لێبێت) گەورەی دروستکراوانە کۆتای پێغەمبەرانە، بەڵگەش قورئانەکەیەتی کە نە کتێبێکی پزیشکیە نە کتێبێکی جادووە کەچی دەردی دڵ تیمار دەکا بە وتەو نوسراوی ڕەوانبێژی هەموان سەرسام دەکا. پوختەی قسان: موعجیزەی کۆتا ئایینی ئاسمانی ئیسلامە، دەکرێ بە هەست ونەست پەی پێبەرین بەتایبەت لەم سەردەمەدا... لەکەڵ ئەوەشدا بەرەنگاری بەردەوامە خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾[1]. واتە: ((ئەی پێغەمبەر موحەمەد، بە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان ـ واتە: جولەکەکان وگاورەکان ـ بڵێ: وەرن با لەسەر قسەیەکی ڕاست و تەواو یەکبگرین، کە بۆ هەموومان وەك یەکە، ئەویش ئەوەیە لە خودا زیاتر کەسێکی تر نەپەرستین هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەین، وەهیچ کەسێکمان کەسێکی تر بە خاوەن شەریعەت و خاوەن فەرمان نەزانین کەشایەنی ملکەچکردن بێ بۆی جگە خودای گەورە، جا ئەگەر ئەوان پشتیان هەڵکردو لەسەر بیرو باوەڕی هەڵەی خۆیان مانەوە، ئەو کات پێیان بڵێن: ئێوە شایەت بن، ئێمە موسوڵمانین و خۆمان بەخودا دەسپێرین))[2].

جارێکی دی دێینەوە سەر باسەکەمان: خەڵکێکی زۆر کۆبونەوە لە پەیامەکەی حەزرەتی عیسا باوەڕیان هێنا لەنێو ئەو باوەڕدارانەدا دوازدە پیاوی خواناسی

---

(١) سورة آل عمران: الآية٦٤.

(٢) بنوارە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل٥٨، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی: نظام الدين عبدالحميد:١/١٣٧، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي:٢/١٠٥، تفسير الجلالين: ص٥٨، وەرگێڕ.

لێهەڵبژاردن، وەك قوتابی وەك هاوەڵی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەكردن، وانەی پێدەدان ڕێنموویی دەكردن، تا ئەوانیش بڕۆنە ناو جولەكەكان بانگەوازبكەن، پاشان حەفتا پیاوی تری لێ هەڵبژاردن، كردنیە نێراو و پەیامبەر تا بچنە شار و گوند وناوچەكان تا پەیامی خوایی بگەیەنن، بەم چەشنە حەزرەت سێ ساڵ مژدەی دەدا بە باوەڕداران، بێ باوەڕانیشی ئاگادار دەكردەوە لە سزاو ئەشكەنجەی دواڕۆژ، خۆی شار بە شار و دێ بە دێ بەنگەوازی دەكرد، ئامۆژگاری وەچەی ئیسرائل و جولەكەكانی دەكردن كەچۆن خۆیان ئازاد كەن لە بەندایەتی دونیا

ئەو زاتە پیرۆزە هێندە سادەبوو كەس وەكی وی نەبوو، زەوی فەرش وڕاخەری بوو، ئاسمان لێفەو بەتانی بوو، بەرد سەرینی بوو، دەستەكانی خزمەت كاری بوو، پێیەكانی ولاخی بوو، ڕەوشت بەرز وگەورەبوو، هەموو كات لە دوای ئاوا بوونی خۆر دەیبینی شوانەكان مەڕو ماڵاتیان پێش خۆیان دەدەن، لەبەردەم خۆیەوە دەیگوت: چۆن و بەچ شێوەیە مەڕە گێلەكانی جولەكە لە گومڕاییەوە بەرەو ڕوناكی و ئازادی بەرم..

دەچووە پەرستگاكانی جولەكەوە مێزو كورسیەكانی دەدا بەسەر یەكا دەیگوت: گەر ئەمە ماڵی خودایە ئەوا دەبێ پەرستنی تێدا بكرێ نەك ببێتە جێگەو مۆڵگەی بازرگانی، وكۆكردنەوەی سەروەت وسامان، ئەوەستا بەڕووی قشەو وئاخوندەكانی جولەكە سەرزەنشتی دەكردن لە سەر دەستێوەردان و ئەو گۆڕینەی كە بەسەر پەیامی موسا (سەلامی خوای لێبێت) هێناویانە، وەچۆن یاریان دەكرد بە بنچینەو بنەما سەركییەكان كە خودا ئاماژەی پێكردبوو لە شەریعەتی موسادا، ئەم هەڵوێستانەی حەزرەتی عیسا بەرامبەر جولەكەكان، زۆرتر ڕق و قینیانی هەڵدەستان بەرامبەری، دەیانویست هەلێ ڕێكەوێ تا لەنێوی بەرن هەروەك

لەئینجیلدا باسی کراوە[1]، جارێ لێیان پرسی: ئەوە دروستە سەرانە بدەینە قەیسەر؟ حەزرەت وەك کەسێکی شارەزا وەڵامی دانەوە، پێیی وتن: ئەو وێنەیە بەو پارەیەوە هی کێیە؟ وتیان وێنەی قەیسەرە. گوتی: دەئەوەی هی قەیسەرە بیدەنە قەیسەر ئەوەشی هی خودایە بیدەنە خودا.

کار گەیشتە ئەوەی لەلای فەرمانڕەوا بۆیان تێچاندو وتیان: سەرانە نادات ـ دەشڵێ من پێغەمبەرم سوکایەتی بە خودای ئێمەش دەکا، ئیدی فەرمانی گرتن ودادگایی کردنی دەرکرا، قەشەو وئاخوندەکانی جولەکە پاداشتێکیان دانا بۆ ئەو کەسەی کە ڕێ و شوێنی ئاشکرا بکات، یەکێ لە دوازدە قوتابیەکەی بەناوی (یهوزا ئەلئەسخەریوتی) تەماع گرتی کۆمەڵە سەرباز وئاخوندە جولەکەکانی بردە ئەو شوێنەی حەزرەتی عیسای لێبوو، پاشان ڕێکەوتن لەسەرئەوەی بچێتە ئەو شوێنە لەگەڵ خۆیدا بیهێنێتە دەرەوە، دواتر دەستگیری بکەن، ویستیان بەوفێڵە لەنێوی بەرن نەیانزانی کە ئەو خودایەی عیسای ڕەوانەکردووە ئاگاداری پیلان و فێڵەکانیانە کاتێ یەهوزا چوە ژوورەوە بۆ لای حەزرەت نەیدیەوە چون خودای گەورە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان وە ڕزگاری کرد لە فێڵ و خیانەت یەهوزا بە سەرسامی هاتەدەرێ، نەیزانی خوای گەورە خستویەتیە سەر شێوەو شکڵی حەزرەتی عیسا کاتێ هاتەدەرەوە دەسبەجێ دەسگیریان کردو ئەو کۆمەڵەی کەچوو بوون بۆ گرتنی هاواریان کرد ئەوە خۆیەتی بیگرن، هێنایان سوکایەتی زۆریان پێکرد جلەکانیان لەبەر داکەند ودەستیان بەزنجیر بەست وگوێنیان بە بەردا کرد، پاشان دەستیان کرد بە لێدانی، یەکێ تف و بەڵغەمی تێ دەگرت، یەکێ جنێوی پێدەگوت، یەکێ بە گۆچانەکەی لێی دەدا، پێیان دەوت: دەی گەر تۆ

---

[1] بنواڕە : ئینجیلی مەتا بەشی ٢٢، بڕگەی ١٧ ـ ٢٢، وئینجیلی بەرنابا بەشی ٣١، بڕگەی٥.

پێغەمبەری پێمان بڵێ کێ لێیدای؟ کێ تفی تێکردی؟ بەوچەشنە بەنێو بازاڕدا بردیان دواتر بەخاچێ بەستیانەوە ڕووەو خەڵك تا بتوانن زیاتر سوکایەتی پێبکەن ئنجا بردیانە تەپۆڵکەیەك دوای ئەوەی ڕووتیان کردووە چوار مێخەیان کێشا....خوای گەورە فێڵ و گزیەکانیانی پوچەڵ کردەوە بەخۆیان وئەوەی خیانەتی لە هاوڕێیەتی حەزرەت کرد... لەم بارەیەشەوە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ۝ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ۝ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ۝﴾[1]، واتە: ((ئەو جولەکانەی لەبەر بێ باوەریان و ئەو بوختانە گەورەیەی کە هەڵیانبەست بۆ(مەریەم) ـ تۆمەتباریان کرد بە داوێن پیسی، کە ئەوە بەفەرمانی خودا سکی پڕبوو لەبەر ئەوانە خودا خستنیە بەرخەشم و غەزەبی خۆی ـ*هەروەها دەیانوت ئێمە پێغەمبەری خودا عیسای کوڕی مەریەممان کوشت، نا ئەوان نەیان کوشت ولە خاچیان نەدا بەڵکە لێیان تێکچوو، کەسێکی تریان لەجیاتی ئەو لەخاچدا، بۆیە سەرسوڕماو بوون لە نێوان خۆیاندا، وە کەوتنە گومانەوە، نەیانزانی کوشتویانە یا خودابەرزی کردۆتەوە ئەوە بوو ئەوەی کوشتیان کەسێکی لەو چوو بوو، هیچ زانیاریەکی دڵنیاکەرەوەیان نەبوو، بەدڵنیاییەوە نەیان کوشتبوو* بەڵکە خودا بەرزی کردەوە بۆلای خۆی، خودا دەسەڵاتدارو خاوەن توانایەکی بێ سنووره))[2].

---

[1] سورة النساء: الآية ١٥٥ ـ ١٥٨.

[2] بنواڕە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل١٠٢، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی: نظام الدين عبدالحميد:٢٦١/١، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي:٨/٦، تفسير الجلالين: ص١٠٣، وەرگێڕ.

جا چۆن باوەڕ بکەین خودا پێویستی بەوەبێ خۆی بخاتە ئەو سوکایەتیەی کەباسمان کرد تا خوایەتی بۆ خەڵك روونکاتەوە !.!

قەشە بەرنابا لە مزگێنیەکەیدا هۆکاری سەرەکی لە سێدارەدانی (یەهوزا)ی باس کردووە، کەئەوە وەرگرتنی سزای خیانەتەکەی نەبوو کە ئەو هاوڕێ و یەکێ بوو لەدوازدە قوتابیەکەی مەسیح، بەڵکە وەلامێکی کردارانەی بەهێز بوو بۆ ئەو کەسانەی دەیانگوت مەسیح خوایە یا کوڕی خوایە..

هەروەها مەسیح خۆی بەزمانێکی پاراو لە مزگێنی بەرنابادا دەڵێت: ((کاتێ خەڵکی بانگیان دەکردم خودا یا کوڕی خودا، کە من هەمیشە پاکانەم لەوە دەکرد بێبەری بووم لێی، خودا ویستی وابو کە هەموو گاڵتە بەمن بکەن لە جیهاندا بەمردنی یەهوزا، کە پێیان وابوو منم ئەوەی مرد لە سەر ئەوسێدارەیە، بۆ ئەوەی شەیتان گاڵتە بە من نەکا لە ڕۆژی دواییدا))[1].

لە کۆتاییدا جێی خۆیەتی بڵێین ئەگەر عیسا خودایە چۆن دەهێڵێ ڕووت وڕسوا کەوێت و لەخاچ بدرێ!!! دەبێ ئەو پەندە چ بێ لەمەدا؟ ئایا خودا دەسەوسان بوو، نەیتوانی خۆ ڕزگار کا، یا هۆکارێکی تر بگرێتە بەر بۆ ڕێنموویی کردنی خەڵکی بۆ ئەوەی کاری چاکە بکەن ودوورکەونەوە لە هەڵەو تاوان!!! ئەوە چ لۆژیکێکە وا بڕوانێتە خوداکەی!!!

---

[1] مزگێنی بەرنابا بەشی ٢٢٠ بڕگەی١٩.

قورئانی پیرۆزیش زۆر بەجوانی بەرێك و ڕاستی کورتە چیرۆکی حەزرەتی مەسیحمان بۆ دەگێڕێتەوە لە چەند ئایەتێکدا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾﴾[1]. واتە: ((کاتێك خودا بە عیسای کوڕی مەریەمی فەرموو: ـ لەڕۆژی زیندوبونەوەدا وەك سەرزەنشتێ بۆ گەل و شوێنکەتوانی ـ ئایا تۆ بە شوێنکەوتوانی خۆتت وتووە: من ودایکم بە دوو خودا بزانن؟ عیساش لە وەڵامدا وتی: خودایە پاکی و بێ گەردی هەر شیاوی تۆیە نابێت من لە سنووری خۆم دەربچم و شتێك بڵێم کە هەقی قسەکردنم تیایدا نەبێت، خۆ ئەگەر ئەو قسەیەم کردبا ئەوە بەڕاستی خۆت دەتزانی، چونکە تۆ دەزانیت چی لە ناو دڵی مندایە، بەڵام ئەوەی لای تۆیە من هیچی لێ نازانم تۆ زۆر ئاگادار و زانای بە گشت شاراوەو نهێنیەکان* من هیچ شتێکم پێنەوتون، جگە لەوەی کە خۆت فەرمانت پێداوم کە بەندایەتی بۆ تۆ بکەن کە پەروەردگاری منیش و پەروەردگاری ئەوانیشی، من تا ئەو ماوەیە لە ناویاندا بووم، ئاگاداریان بووم، بەڵام پاش ئەوەی منت مران ئیتر خۆت ئاگادار و چاو دێریت بەسەریانەوە، وەهەر خۆت تەواو ئاگاداری هەموو شتەکانی))[2].

---

[1] سورة المائدة: الآية ١١٦ ـ ١١٧.

[2] بنوارە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل ١٢٧، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی: نظام الدين عبدالحميد: ١/ ٣١٦، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي:٦/٣٧٤، تفسير الجلالين: للمحلي والسيوطي:ص١٢٧ ، وەرگێڕ.

**هەروەها دەفەرموێ:** ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتۡهُ فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ﴿٣١﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارٗا شَقِيّٗا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٣٦﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾﴾[1]. **واتە: ((ئەی پێغەمبەر تۆ لە قورئاندا باسی خاتوو مەریەمی دایکی عیسایان بۆ بکە، کە خۆی لە کەس و کاری دوور خستەوە، بۆ خودا پەرستی لەلای ڕۆژهەڵاتی قودسەوە چووە پەنایەك* ئینجا لەو شوێنەدا پەردەیەکی لە نێوان خۆی وکەلەکەی دانا، ئێمەش**

---

[1] سورة مريم : الآية ١٥ ـ ٣٧

(ڕۆحی خۆمان ـ واتە: جوبرەئیل)[١]مان لە شێوەی ئادەمیزادێكی ڕێك وپێكدا نارد بۆ لای* كاتێك مەریەم جوبرەئیلی بینی، ترساو وتی: من خۆم بەخودای میهرەبان وخاوەن بەزەیی دەپارێزم لە تۆ، جا ئەگەر تۆ لە خودا دەترسیت، ئەوەلاچۆ لێم مەیە پێش* جوبرەئیل پێی وت: بێگومان من لەلای پەروەردگارتەوە نێرراوم بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی بە فەرمانی خودا منالێكی زیرەكت پێ ببەخشم كە دەبێتە پێغەمبەر* مەریەمیش بەترس و شەرمەوە وتی: جا من چۆن مندالّم دەبێت، كە هێشتا مێردم نەكردوە و هیچ پیاوێك لێم نزیك نەكەوتۆتەوە، وە لەو ئافرەتانەش نیم كە بەدڕەوشت و داوێن پیسن* جوبرەئیل وتی: ئەمە فەرمانی خودایەو وا دەبێت، پەروەردگارت دەفەرموێت: ئەو كارە بۆ من زۆر ئاسانە، بەبێ ئەوەی هیچ پیاوێك توخنت بكەوێ، دەیهێنمە دی، بۆ ئەوەی ئەمەش ببێتە بەلگەیەكی تر بۆ خەلكی لەسەر تاكو تەنهایی دەسەلاتی من، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو مندالە لە پاشە ڕۆژدا ببێتە ڕەحمەتێكی ئێمە بۆ نەوەی ئیسرائیل، بەوەی كە دەبێتە دوا پێغەمبەریان، ئەوەش بڕیارێكی خودایە و دەبێ بێتە دی* دوای ئەوە جوبرەئیل فویەكی كرد بەسەر مەریەمدا و سكی پڕ بوو، ئینجا لە ترسی ئەوەی خەلكی بە داوێن پیسی تاوان باری نەكەن چووە پەنایەكی دوور* پاش ماوەیەك ژانی مندالبوون زۆری بۆ هێنا و بەرەو پەنای دارخورمایەك ڕۆیشت لێرەدا بەدەم ئازارەوە وتی: ئای خۆزگایە پێش ئەمە بمردمایە و شتێكی بێ كەلك بوومایە و هەر

---

[١] ئیمامی قورتوبی دەڵێت: دوو بۆچوون هەیە لەسەر مانای:.﴿فأرسلنا إليها روحنا﴾ هەندێ پیان وایە مەبەست لە(ڕۆح) عیسایە، چون خوای گەورە لە پێش جەستەی ڕۆحی دروست كردووە، بەلام هەندێكی تر دەلێن: مەبەست لە (جوبرەئیل)ە وەئەمەش ڕاستە چون دواتر خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فتمثل لها بشرا سويا﴾ واتە: فریشتەكە چووە شێوەی ئادەمیزادێكی تەواو وە بۆیە وشەی ڕۆح خراوەتە پاڵ وشەی (الله) لەبەر تایبەتمەندی و ڕێز... بنواڕە: الجامع لأحكام القرآن:١١/٩٠، وەرگێڕ.

له بیر بچوومایەتەوە* لەخوار دار خورماکەدا جوبرەئیل بانگی مەریەمی کردو وتی: غەمبار مەبە پەروەردگارت لەلای خوارتەوە جۆگە ئاوێکی بۆ ڕەخساندویت* کۆتەرەی ئەو دار خورمایەش ڕابوەشێنە خورمایەکی گەیووی خۆشت دەست دەکەوێ و بۆ دەکەوێتە خوارێ* جا لەو خورمایە بخۆ و لە جۆگەلەکەش ئاو بخۆرەوە، وەچاو ڕۆشن بە بە منداڵەکەت[1]، هیچ خەم وخەفەت مەخۆ، ئەگەر کەسێکیش پرسیاری ئەم منداڵەی لێ کردی بڵێ: من لەخۆم گرتووە (نەزرم کردوە) بۆ خودا کە ئەمڕۆ لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا نەدوێم وقسە ناکەم* پاشان مەریەم منداڵەکەی بە باوەشەوە هێنایەوە بۆ ناو کەسوکاری، کاتێ نەتەوەکەی ئەم دیمەنەیان بینی، وتیان: ئەی مەریەم بەڕاستی تۆ کارێکی زۆر خراپت ئەنجامداوە - مەبەستیان ئەوە بوو لەداوێن پیسیدا ئەو منداڵەی بووە، چونکە هێشتا شوی نەکردبوو، تا بڵێن ئەم منداڵە لە مێردەکەیەتی -*پاشان پێیان وت: ئەی خوشکی هارون[2]، تۆ نە باوکت پیاوێکی خراو بووە، نەدایکیشت داوێن تەڕ بووە.. تۆ چۆن

---

[1] ئیمامی تەبەری دەڵێت: گاورەکان پێیان وایە کاتێ مەریەم سکی بە عیسا پڕ بوو، تەمەنی سیازدە ساڵ بوو، عیساش ژیا تا تەمەنی بوو بە سی و دوو ساڵ و چەند ڕۆژێك پاشان بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان، وە مەریەمی دایکی شەش ساڵی تر لەدوای بەرزبونەوەی عیسا ژیا بنواڕە: الجامع لأحكام القرآن ٩١/١١:.

[2] خوشکی هارون: لەسەرئەم وتەیە، زانایان بۆچونی جیاوازیان هەیە: هەندێ پێیان وایە: مەبەست لە هارونی برای موسایە، ئەمەشە ئەوەنەگەیەنێ: مەریەم لە نەوەی هارونی برای موسایە، وەبۆیە وتویەتی خوشکی هارون چون لەناو عەرەبدا باوە کە وشەی برا لە بری ڕۆڵە یا نەوە بەکار دێ هەروەك چۆن دەڵێن (أخ العرب) واتە: نەوەی عەرەب، هەندێکی تریێیان وایە: مەبەست ئەوە نییە کە خوشکی هارونی برای حەزرەتی موسایە، بەڵکە مەبەست لەوە توانج گرتنە لەمەریەم واتە خۆ تۆ بەلای خۆتەوە لە خواپەرستیدا وەك هارون بوویت، دەی چۆن ئەم کارەت ئەنجام داوە.. هەندێکی تر پێیان وایە برایەکی لە باوکەوە هەبووە ناوی هارون، (کەعبی ئەحبار) کەیەکێ بوو لە جولەکەکانی مەدینە وپاشان موسوڵمان بوو، لە بەردەم خاتوو عائشەدا وتی: مەریەم خوشکی هارون نییە، خاتوو عائشە وتی:

ئەو کارە پیسەت ئەنجام داوە*مەریەم لەوەلآمدا بە هێما پێی وتن کەپرسیار لەو منداڵە بکەن، ئەوانیش وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵێکی ساوا بکەین کەهێشتا لە بێشکەدایە واتە: زمانی نیە وقسەنازانێ* عیسا کەوتە قسە وتی: بەڕاستی من بەندەی خودام، خودا بە تواناو فەرمانی خۆی لە سکی دایکمدا خولقاندومی، وەبڕیاری داوە کە گەورەبیم بمکاتە پێغەمبەر و کتێبێکم بۆ بنێرێت کە ئینجیلە* وەهەروەها کردومیە مایەی خێرو بەرەکەت لە هەر جێگەیەکدا بم، وە فەرمانی پێکردوم تا لە ژیاندا بم نوێژ بکەم وزەکات بدەم* وە وای لێکردوم بە چاکەو ڕێزەوە ڕەفتار لەگەڵ دایکمدا بکەم، وەنەیکردومەتە کەسێکی نەگبەت وسەرکێش* سڵاوی خودام لەسەربێت لەو ڕۆژەی لەدایك بووم وەلەوڕۆژەی کەدەمرم، هەروەها لەو ڕۆژەش کە تێیدا زیندودەکرێمەوە* ئەوەی کە وترا قسەی ڕاست و تەواوە سەبارەت بە عیسای کوڕی مەریەم، کە بەفەرمانی خودا بەبێ باوك لەدایك بووە، بەندەیەکە لە بەندەکانی خودا نە کوڕی خودایە وەك هەندێکتان وا دەڵێن، نە خوداشە وەك هەندێکی ترتان دەیڵێن، وە نە یەکێکە لە سێ کوچکەی خوایەتی وەك هەندێکی ترتان وادەڵێن* خودا کەسی نەکردووە بە کوڕی خۆی، خودا پاکەو بێ گەردە وە بەرزترە لەوەی کە کوڕی ببێ، ئەگەر خودا بڕیار بدات لەسەر دروست بوونی هەرشتێك ، ئەوە دەفەرموێ ببە، دەس بەجێ دێتە بوون* هەروەها لەو

---

ڕاست ناکەی، وتی :ئەی دایکی ئیمانداران ئەگەر پێغەمبەری خودا ئەمەی وتووە، ئەوە ڕاستە، ئەگەر نا ئەوە من هەواڵم لایە کە نێوان مەریەم وهارون شەش سەت ساڵە، ئیدی خاتوو عائشە بێدەنگ بوو، لە (صحیحی موسلیمدا) هاتووە، موغیرەی کوڕی شوعبە دەڵێ: کاتێ نوێنەری هۆزی نەجران هاتن پرسیاریان لێکردم وتیان ئێوە دەخوێننەوە: ﴿یا أخت هارون﴾ وە موسا پێش عیسا هاتووە بەوەندە ساڵی زۆر؟ کاتێ هاتمە لای پێغەمبەر(درودی خوای لێبێت) لەسەر ئەمە پرسیارم لێکرد، لە وەڵامدا فەرمووی ((ئەوان بانگ دەکران وناوئەندران بەناوی پێغەمبەر وپیاوچاکانی پێش خۆیان)) الجامع لأحكام القرآن :١١/١٠٠، وەرگێڕ.

قسانەی کە عیسا بە نەتەوەکەی وت: بەراستی خودای گەورە پەروەردگاری منیش وئێوەشە، وە ئەو هەمووماني دروست کردووە، دەی بیپەرستن، وە ئەوەشە ڕێگای ڕاست و دروستی خودا* پاشان دەستە و تاقمەکان دەربارەی عیسا بوون بە چەند بەشێکەوە ـ تاقمێ دەیوت: خودایە، یەکێکی دی دەیوت: کوڕی خودایە، تاقمێکی تر دەیوت: سێیەمی سێ کوچکەی خوایەتیە، بەڵام جولەکەکان دەیانوت زۆڵە، هەندێکی تریش دەیانوت بەندەو نێراوی خودایە هەربەشەی بەجۆرێ باوەڕی هەبوو ـ وای بۆ ئەوکەسانەی بێ باوەڕن ـ بەوەی باسی ڕاستەقینەی لەدایك بوون و ژیان وحەقیقەتی عیسا و دایکی ـ ، کاتێ لەڕۆژی مەحشەردا کۆدەبنەوەدیمەنێکی گەورەو سامناك دەبینن))[1].

وەهەروەها دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ ۖ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾﴾[2]، واتە: ((جوبرەئیل

---

[1] بنوارە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل٣٠٦، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی: نظام الدین عبدالحمید:٢/٧٦٦، الجامع لأحکام القرآن للقرطبي: ١١/ ٩٠، تفسیر الجلالین:ص٣٠٦، وەرگێڕ.

[2] سورة آل عمران: الآیة ٤٥ ـ ٥١.

به مەریەمی وت: ئەی مەریەم خودا مژدەت دەداتێ بەوەی منداڵێکت دەبێ ناوی مەسیحی عیسای کوڕی مەریەمە ـ ناوی نا بەناوی دایکیەوە تا پێی ڕابگەیەنێ کە عیسا بەبێ باوك لە دایك دەبێ ـ ، لە دونیادا کەسێکی بەرزو بەڕێزە، لە ڕۆژی دواییشدا یەکێکە لە نزیکەکانی خودا* ئاخاوتن لە گەڵ خەڵکی دەکات لە نێو بێشکەکەیدا هەروەك لە تەمەنی گەورە ساڵیدا قسان دەکا[1]، وەدەبێتە یەکێ لە پیاو چاکان* مەریەم وتی: خودایە من چۆن منداڵم دەبێ کەهێشتا مێردم نیە ودەستم بە هیچ مرۆڤێکەوە نەگەیشتووە، وەڵامی دایەوە: کە خودا چۆنی ویست وەها دەیخولقێنێ ، هەرکات بیەوێ کارێ بێتە بوون و جێ ، ئەوە پێی دەبێژی ببە دەست بەجێ دەبێ* خوای گەورە عیسای فێری خوێنەواری و نووسین و دانایی وتەورات وئینجیل کرد* وەدەیکاتە پێغەمبەر بۆ نەوەی ئیسرائیل تا پێیان بڵێت ـ پاش ئەوەی بوو بەپێغەمبەریان ـ وتی: من بە موعجیزەوە هاتووم بۆ ناوتان، ئەویش ئەوەیە کە لە قوڕ شێوە باڵندەیەك دروست دەکەم و فووی تێ دەکەم، بە فەرمانی خودا دەبێتە باڵندەیەك، وە بەفەرمانی خودا کوێری زگماك و پێست بەڵەك چاك دەکاتەوە، وە مردوو زیندوو دەکەمەوە بە ویستی خودا، وهەواڵتان پێدەدەم

---

(1) خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ویکلم الناس في المهد وکهلا ..﴾ واتە عیسا قسان دەکات لە بێشکە هەروەها لە کاتی گەورەبوونی،(کهل) لەزمانی عەرەبیدا وەك قورتوبی دەڵێت: ((الکهل بین حال الغلومة وحال الشیخوخة)) واتە: ئاستێکە نێوان تازە پێگەیشتوو (لاویەتی) و پیریدایە... هەروەها زانایانیش دەڵێن: حەزرەتی عیسا تەنها ئەو کاتە قسەی کردووە لەمنداڵیدا کە لەسەر پاکێتی دایکی و بەندەیەتی خۆی قسەی کردووە پاشان چۆتەوە دۆخی هەموو منداڵێك، بە بەڵگەی ئەوەی هیچ شتێك نەهاتووە کەباس لە بەردەوامی قسەکردنەکەی بکات، خۆ ئەگەر وا بوایە باس دەکرا..وە هەموو تاقم وئایینەکان لەسەر ئەوەن کە خاتوو مەریەم داری حەدی لێ نەدرا پاش ئەوەی تۆمەت باریشیان کرد، چون هاتنە قسەی عیسا پاکێتی مەریەمی دەرخست. بنواڕە: الجامع لأحکام القرآن:٢/٩٠، ١١/١٠٣، وەرگێڕ.

که چیتان خواردووه وه‌چیتان هه‌ڵگرتووه له‌ماڵه‌کانتان[١]، به‌دڵنیاییه‌وه ئه‌مانه به‌ڵگه‌ن بۆ ئێوه ئه‌گه‌ر ئێوه بڕوادارین* هه‌روه‌ها هاتووم بۆ باوه‌ڕ هێنان به‌و ته‌وراته‌ی که‌له به‌رده‌ستماندایه، بۆ ئه‌وه‌ی هه‌ندێ له‌و شتانه‌ی که لێتان قه‌ده‌غه‌کراوه بۆتان حه‌ڵاڵ بکه‌مه‌وه‌وه، هاتووم به چه‌ند موعجیزه‌و به‌ڵگه‌یه‌ك له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاره‌وه، ده‌ی ئێوه‌ش له‌خودا بترسن و گوێ ڕایه‌ڵ بن* دڵنیابن که خودا په‌روه‌ردگاری منه‌و په‌روه‌ردگاری ئێوه‌شه، ده‌ی هه‌مووتان هه‌ر ئه‌و بپه‌رستن، ئه‌وه ڕێی ڕاست و ته‌واوه*))[٢].

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

[١] هه‌ندێ له زاناکانی ته‌فسیر ده‌ڵێن: حه‌زره‌تی عیسا هه‌ر باڵنده‌یه‌کی که دروستی ده‌کرد له پێش چاوی ئه‌وانه‌دا ده‌فڕی پاش ئه‌وه‌ی ونده‌بوو ده‌که‌وته خوارێ وده‌مرد، وه ڕۆژانه زیاتر له په‌نجا هه‌زار که‌سی نه‌خۆشی چاره‌سه‌رده‌کرد به‌و مه‌رجه‌ی بڕوا بهێنن، وه‌عازری هاوڕێی زیندوکرده‌وه که چه‌ند ڕۆژێ بوو مردبوو، دوایی ژیاو منالێکیشی بوو ئه‌وجا مرد، وه هه‌روه‌ها کوڕی پیاوه پیره‌که، ده‌یانبرد بۆ گۆڕستان له ناو تابوته‌که‌ی زیندووبۆوه، جله‌کانی له‌به‌رکرده‌وه‌و بردیه‌وه بۆماڵه‌وه وکچی ئه‌لعاشیری زیندوکرده‌وه وه‌پاش ئه‌وه ژیان تا وه‌چه‌شیان لێکه‌وتۆته‌وه، وه ده‌ڵێن: بۆ چه‌ند ساتێ سامی کوری نوحیشی زیندوکردۆته‌وه کاتێ داوایان لێکرد وتیان تۆ ئه‌و که‌سانه زیندو ده‌که‌یته‌وه که له‌م نزیکانه مردوون، ده‌ی ئه‌گه‌ر ڕاست ده‌که‌ی سامی کوری نوحمان بۆ زیندوکه‌ره‌وه، وتی: پێم بڵێن گۆڕه‌که‌ی له‌کوێیه، بردیانه گۆرستان پیشانیان دا، ئه‌ویش دوعای کردو سام له‌قه‌بره‌که‌ی هاته‌ده‌رێ سه‌ری سپی ببوو، حه‌زره‌تی عیسا لێی پرسی بۆ وا سه‌رت سپی بووه خۆ له‌سه‌رده‌می ئێوه‌دا سه‌ری سپی بوون نه‌بووه، ئه‌ویش وتی: ئه‌ی ڕۆحی خودا: کاتێ تۆ دوعات کرد گوێم له ده‌نگێك بوو، وتی وه‌ڵامی ڕۆحی خودا بده‌ره‌وه، ئیدی گومانم برد که ڕۆژی زیندوبونه‌وه‌یه له‌تاوا سه‌رم سپی بوو، پاشان پرسیاری ڕۆح کێشانی کرد وتی: ئه‌ی ڕۆحی خودا تاڵی ڕۆح کێشان تا ئێسته‌ش له گه‌رومدا ماوه .. وه له‌نێوان مردنی سام تا ئه‌و کاته چواره‌زار ساڵ بوو، پاشان سام به خه‌ڵکه‌که‌ی وت: ده‌ی به‌ڕاستی بزانن باوه‌ری پێ بهێنن ئه‌و پێغه‌مبه‌ری خودایه، به‌شێك به‌ڕاستیان زانی ئه‌وانی تریش وتیان ئه‌مه سیحره.... بنواڕه: الجامع لأحكام القرآن:٩٥/٢، تفسير الجلالين: للمحلي والسيوطي:ص٥٥، وه‌رگێڕ.

[٢] بنواڕه: قورئانی پیرۆز وه‌رگێڕاوی مامۆستا هه‌ژار:ل٥٥، ته‌فسیری گوڵشه‌ن: نوسینی: نظام الدين عبدالحميد: ص١٣١/١، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي:٨٨/٢، تفسير الجلالين:ص٥٥، وه‌رگێڕ.

## کورتەیەك لەچیرۆکی مەسیح لە ئینجیلی مەتادا

ئینجیل وەك پێشتر باسمان کرد لە چوار مزگێنی ڕێ پێدراو لەلایەن مەسیحیەتەوە پێك هاتووە (مەتا، مەرقەس، لۆقا، یۆحەنا) ، هەموویان بەیەك شێوە بەسەرهاتی عیسای کوڕی مەریەم دەگێڕنەوە، یەك لەو ئینجیلانە هەڵدەبژێرین، لە ڕێی ئەوەوە بەسەرهاتی مەسیح دەگێڕینەوە... هەروەها دواتر دێینە سەر کورتەیەك لە ناوەڕۆکی کرداری نێراوان لە نامەکانیاندا.. ئەمەش پێش ئەوەی بێینە سەر باسی ناوەڕۆکی یەکێ لەو ئینجیلانەی کە قەدەغەکراوە کە بریتیە لە (بەرنابا) پاشان ئەوەی مەبەستە لێیان هەڵێنجین:

### مزگێنی مەتا

- بەشی یەکەم:

لە کاتێکا کە مەریەم دەزگیرانی یوسف بوو، پێش ئەوەی بگوێزرێتەوە، بەهۆی ڕۆحی ڕەوانەوە[1]، سکی پڕ بوو، یوسفی دەزگیرانی کوڕێکی زۆر پاك و بێ گوناه بوو، نەیویست ئەم کارە ئاشکرا بکات، بڕیاریدا وازی لێ بێنێت. لەو ماوەیەدا کەبیری لای ئەم باسە بوو، فریشتەیەك کە لە خوداوە هاتبوو، لەخودا بۆی دەرکەوت وپێی وت: ئەی یوسف کوڕی داود مەترسە لەوەی لە مەریەمت بینی، چونکە ئەوەی ئەو سکی پێی هەیە بریتیە لە ڕۆحی ڕەوان. کوڕێکی ئەبێت ناوی ئەنێت عیسا چونکە ئەو ئەو کەسەیە کە گەلەکەی لە گوناه ڕزگار ئەکات، ئەمانە هەمووی ڕوویدا، تاکو بێتە دی ئەوەی خودا لە سەر زوبانی نێراوانی خۆی

---

[1] روح القدس: ڕۆحی رەوان: واتە ڕۆحی پیرۆز یاخود ڕۆحی یەزدان، بریتیە لە یەکێ لە و سێ کوچکەیەی کە بناغەی باوەڕی مەسیحیەتی لەسەرە(باوك ، کوڕ، ڕۆحی پیرۆز) بنوارە: پەراوێزی مزگێنی مەتا بەکوردی: ل٢، وەرگێڕ.

ڕایگەیاند، ئا ئەوەتا کچێك سکی پڕ ئەبێت و کوڕێکی ئەبێ ناو ئەنرێ بە عمانۆئێل[١]، واتە خودا لەگەڵمانە، کاتێ یوسف خەبەری بوەوە، ئەوەی فریشتەکە فەرمانی پێدا، کردی، هەستاو دەزگیرانەکەی هێنایەماڵەوە، بێ ئەوەی لەگەڵیا جووت بێت تا بوونی مناڵەکە، کاتێ بوو ناویان نا عیسا[٢].

- بەشی دووەم:

دوای لە دایك بوونی عیسا لە سەردەمی هێرۆدس[٣]، لە بەیت لەحم[٤]هەندێ لە ئەستێرە ناسان هاتن، پرسیان کوا پادشای جولەکە ئەوەی لەدایك بووە؟ ئێمە لە ڕۆژ هەڵاتەوە ئەستێرەی ئەومان بینی، هاتووین کڕنوشی بۆ بەرین ...دوای ئەمە هێرۆدس بەنهێنی ئەستێرە ناسەکانی بانگ کردە لای خۆی و پرسیاری لێ کردن لە بارەی کاتی دەرکەوتنی ئەو ئەستێرەیە، ئینجا ناردنی بۆ بەیت لەحم، پێی وتن: بڕۆن باش بگەڕێن کاتێ مناڵەکەتان دۆزیەوە، هەواڵم بدەنێ، تاکو منیش بێم و کڕنوشی بۆ بەرم... ئەمان کاتێ ئەستێرەکەیان دی، زۆر شادمان بوون، چوونە ژورەوە، مناڵەکەو مەریەمی دایکیان دی، ...ئینجا ئەستێرە ناسەکان بە هۆی خەوێکەوە لە خوداوە ئاگادارکرانەوە کە نەگەڕێنەوە لای شا هێرۆدس، ئەوسا ئەوانیش لە ڕێگەیەکی ترەوە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان دوای ئەوەی ئەوان

---

[١] عمانوئیل: ناوێکی عیبریە بەواتای خودا لەگەڵمانە، وە بەعیسا ووتراوە. بنوارە: پاراوێزی مزگێنی مەتا بەکوردی: ل٢، وەرگێڕ.

[٢] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی یەکەم: برگەی: ١٨ ـ ٢٤.

[٣] هێرۆدس: چوار کەس بەنێوی هێرۆدس بەناو بانگ بوون، یەکەم هێرودسی گەورە، عیسا لەسەردەمی ئەودا لەدایك بووە، وەهەرچواریان حوکمڕانی ڕۆمە داگیرکەرەکان بوون لە فەلەستینا. بنوارە: پەراوێزی مزگێنی مەتا بەکوردی: ل٢، وەرگێڕ.

[٤] ناوێکی عیبریە، ناوی شارێکە دەکەوێتە خواری ئۆرشەلیمەوە، ساڵی ٣٢ی زایینی کڵێسەیەکی تیادا دروست کرا بەکۆنترین کڵێسەی جیهان دائەنرێت. بنوارە: پەراوێزی مزگێنی مەتا: ل٢، وەرگێڕ.

ڕۆشتن فریشتەیەك لە خوداوە لە خەوا بە یوسفی وت: هەستە منالّەکەو دایکی ببە بۆ میسر، لە وێ بە هەتا فەرمانی گەڕانەوەت پێ ئەدەم، چونکە هێرۆدس ئەگەڕێ بەشوێن منالّەکەدا تا بیکوژێ کاتێ هێرۆدس هەستی بەوە کرد ئەستێرە ناسەکان گاڵتەیان پێ کردوە، تووڕە بوو، هەستا بە کوشتنی هەموو منالانی شاری بەیت لەحم و دەوروو پشتی لە دوو ساڵ بەرەو خوارتر، هەموو ئەوانەی دوای کاتی ئەستێرەکە لە دایك بوون، کاتێ کە هێرۆدس مرد، فریشتەیەك لەلای خوداوە چووە خەوی یوسف لە میسر .. ئینجا لە خواوە پێی نیشان درا کە بڕوا بۆ ناوچەی جەلیل گەیشتە شارێك کە ناوی ناسیرە بوو..[1].

- بەشی سێیەم:

هەر لە و ماوەیەدا یۆحەننای ئاو هەڵکێشەر (المعمدان) لە دەشتی یەهودیادا، ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد ئەیووت: پەشیمان بنەوە لە گوناه حوکمڕانی خودا نزیك بۆتەوە ... خەڵکی ئۆرشەلیم و ناوچەی یەهودیاو گوندەکانی نزیك ئۆردن ئەهاتن بۆلای و لە سەر دەستی ئەو دانیان بە گوناهیان ئەناو، لە ڕووباری ئوردن خۆیان لە ئاو هەڵدەکێشا، کە یۆحەننا دی زۆرێ لە فەریسیەکان[2] وسەدوقیەکان[3] دێن بۆ خۆ لە ئاو هەڵ کێشان، پێی وتن: ئەی نەوەی مار، کێ پێی ووتن ئێوە ئەتوانن لە دادگای خودا ڕزگارتان بێ؟ بەرووبوومێ بدەن کە پەشیمان بوونەوەتان بە ڕوونی

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا، بەشی دووەم: بڕگەی: ١، ٢، ٣، ٧، ٨، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٦، ١٩، ٢٣.

[2] فەریسیەکان: کۆمەڵێ بوون لە جولەکە، باوەڕیان بە زیندو بوونەوە هەبوو، چاکەو خراپەیان دائەنا بە ئەندازە، بۆ پاداشت وسزای دواڕۆژ خورەوشتیان وەك میرات بۆ مابوەوە لە ڕێژەی یاسای خودا دایان نابوو، بگرە زیاتر..بنواڕە: پەراوێزی مزگێنی مەتا بەکوردی : ل٦، وەرگێڕ.

[3] سەدوقیەکان: دەوڵەمەند و خوێنەوارو پایەبەرز بوون لە ئایینا، بە پێچەوانەی فەریسیەکانەوە باوەڕیان بە زیندو بوونەوە نەبوو، لەکاتی داگیر کردنی ڕۆمەکانا دەستیان ئەڕۆشت، زۆرێك لە سەرۆکی پەرستگاکانی جولەکە لەمان بوون.. بنواڕە: پەراوێزی مزگێنی مەتا بەکوردی : ل٦، وەرگێڕ.

دەرخات، لە خۆتانەوە مەڵێن: ئێمە ئیبراهیممان هەیە     من بۆ پاك بونەوەتان لە گوناه لە ئاو هەڵتان ئەکێشم بەڵام ئەوەی لە دوای من دێت، بە توانا ترە، من شایانی ئەوە نیم تەنانەت پێڵاوەکانیشی بۆ هەڵگرم     کاتێ عیسا خۆی لە ئاو هەڵکێشا و لە ئاوەکە بەرزبوەوە، ئاسمان کرایەوە ڕۆحی خودا لە شێوەی کۆترێکدا هاتەخوارەوە بۆی، ئینجا دەنگێك لە ئاسمانەوە هات، وتی: ئا ئەوەتا کوڕی خۆشەویستم ئەوەی زۆر پێی دڵشادم ..[1].

- **بەشی چوارەم:**

**(ئەم بەشە باس لە چۆنیەتی تاقی کردنەوەی عیسا دەکات لەلایان شەیتانەوە... هەروەك لەم بڕگانەی خوارەوە هاتووە)**

شەیتان پێی وت: گەر ڕاستە تۆ ڕۆڵەی خودای لێرەوە خۆت فرێدەرە خوارەوە، چونکە نوسراوە فەرمان ئەدا بە فریشتەکانی ئاگادارت بن. وە لەسەر دەستیان هەڵتگرن نەك پێت بەر بەردێ بکەوێ. عیسا پێی ووت: دووبارە نوسراوە خودات تاقی مەکەرەوە. لەو کاتەدا عیسا دەستی کرد بە بڵاو کردنەوەی پەیامەکەی و ئەیووت: داوای پاك بوونەوە بکەن، پادشایەتی ئاسمان نزیك بۆتەوە. لە کاتێکا عیسا بە کەناری دەریاچەی جەلیلا ئەڕۆیشت، دوو برای دی، شەمعون کە پێی ئەوترا پەترۆس، لەگەڵ ئەندەراوس، تۆڕیان فڕێ ئەدایە دەریاوە ئیشیان ڕاوە ماسی بوو. پێی وتن: وەرن دوام کەون، ئەتانکەم بەڕاو کەری مرۆڤ .. هەروەها عیسا بە هەموو ناوچەی جەلیلا ئەگەڕا، جولەکەکانی لە شوێنی کۆبونەوەکانیانا فێر ئەکردو مزگێنی پادشاهێتی ئاسمانی ئەدانێ و نەخۆشی و دەردی لە گەلەکەدا چارەسەر دەکرد. بەمە دەنگوباسی عیسا گەیشتە سوریاش، چی نەخۆشی دەردی

---

[1] بنوارە: مزگێنی مەتتا بەکوردی، بەشی سێیەم: بڕگەی: ١، ٢، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١١، ١٦، ١٧.

گران هەبوو، بە جۆرەها ئازارەوە، ڤ دارەکان و شەل و گۆجەکان هەموویان هێنا بۆ لای چاکی کردنەوە..[١].

- بەشی پێنجەم:

عیسا کە خەڵکەکەی بینی چووە سەر بەرزاییەك، هەر کە دانیشت قوتابیەکانی لێی نزیك بوونەوە، دەستی کرد بە قسە کردن و فێر کردنیان وتی: خۆزگە بەوانەی هەژارن بە دەرون، چونکە لە پاشایەتی ئاسمانا بەشدارن. خۆزگە بە لێو بە بارەکان، چونکە دڵنەوایی ئەکرێن. خۆزگە بە دڵ نەرم و هێمنەکان، چونکە زەوی بۆ ئەوان ئەمێنێتەوە، خۆزگە بە برسی و تینوەکان بۆ چاکە، چونکە تێرئەبن، خۆزگە بە دڵ پڕ لە بەزەییەکان چونکە بەر بەزەیی خودا دەکەون...دڵ خۆش و شادمان بن چونکە پادشاتان مەزنە لەئاسمان، هەر بەم شێوەیەش بوو کە نێراوانی خودا پێش ئێوە چەوسانەوە، ئێوەن خوێی زەوی گەر خوێ خراپ بوو تامی نەما، چی تامە سوێرەکەی بۆ دەگەڕێنێتەوە؟ بە کەڵکی هیچ نایەت ئەوە نەبێ کە فڕێ بدرێتە دەرەوە خەڵکی پێشێلی بکەن...[٢].

بەم شێوەیە حەزرەتی عیسا بەردەوام دەبێ لە ئامۆژکاری و ئاگادارکردنەوە.. وەبڕگەکانی تری ئەم بەشە بەو شێوەیە دەدوێن ..

- بەشی شەشەم:

وەك بەشی پێنجەم باس لە ئامۆژگاری و ئاگادارکردنەوە دەکات، وە لادەدا بۆ باس کردنی نوێژ وەك لەم بڕگانە باسی هاتووە...

---

[١] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی چوارەم : بڕگەی: ٦، ٧، ١٧، ١٨، ١٩، ٢٠، ٢٣، ٢٤.

[٢] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی پێنجەم: بڕگەی: ١ـ ٨ ، ١٣، ١٤.

ئەتوانن ئاوها نوێژکەن: ئەی باوکمان لە ئاسمان با ناوت پیرۆز بێت با حوکمڕانیەکەت دەست پێ بکات، با خواستت لەسەر زەوی وەك هی ئاسمان بێ، نانی ڕۆژانەمان بەرێ، لە گوناهمان خۆش بە، ئێمەش لە گوناهی ئەوانە خۆش ئەبین کە هەڵەمان بەرامبەر دەکەن. مەمان خەرە تاقی کردنەوە، بەڵکو ڕزگارمان بکە لە کاری شەیتانی. گەر لە هەڵەی خەڵکی خۆش بوون، ئەوا باوکی ئاسمانیتان لە هەڵەکانتان خۆش ئەبێ..[(١)].

- بەشی حەوتەم :

ئەم بەشە هەمووی ئامۆژگاریە، وەقسەکانی بەم شێوەیە کۆتایی ئەهێنێ ..

ئەوەی گوێی لەم وتانەم ئەبێت و هەڵسوکەوتی پێ ئەکات، وەك پیاوێکی دانا وایە کە بناغەی خانووەکەی لەسەر بەرد دروست کرد بێت. کاتێ باران باری، لافاو هەڵساو ڕەشەبا هات و لە خانووەکەیدا، خانووەکەی نا ڕووخێت، چونکە لەسەر زەویەکی بەردین دروستی کردووە، ئەوەش کە گوێی لەم وتانەم ئەبێت و هەڵسو کەوتی پێ ناکات، لە کابرایەکی نەزان ئەکات کە خانووەکەی لەسەر لم دروست کردبێت، کاتێ باران باری لافاو هەڵساو ڕەشەبا هات و لە خانووەکەی دا خانووەکەی ئەڕووخێنێ، بەڵام ڕووخانێکی چاك..[(٢)].

کاتێ عیسا کۆتایی بە قسەکانی هێنا هەموو ئەوەی گوێی لێ بوو سەرسام بوون، چونکە وەها فێری دەکردن وەك کەسێکی بەدەسەڵات نەك تەنها وەك نوسەرێ ..

---

[(١)] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی شەشەم: برگەی: ٩ ـ ١٤.

[(٢)] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی حەوتەم: برگەی: ٢٤ـ ٢٩.

- بەشی هەشتەم:

کاتێ عیسا لەسەر بەرزاییەکە هاتە خوارەوە، کۆمەڵێ خەڵکی زۆر دوای کەوتن، پیاوێك کە نەخۆشی گولی هەبوو، هاتوو کڕنوشی بۆ برد و وتی: گەورەم: گەر بتەوێت ئەتوانی پاکم بکەیتەوە، عیسا دەستی ڕاکێشاو دەستی لێداو وتی: من ئەمەوێ پاك بەرەوە، کابرا دەست بەجێ برینی پێوە نەما..[1].

بەشی هەشتەم زۆرێك لە موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا باس دەکات ..

- بەشی نۆیەم:

کاتێ عیسا لە نزیك شوێنی باج وەرگرتنێکا تێ ئەپەڕی، باج گرێکی بینی کە ناوی مەتا بوو، لەسەر شوێنی باج گرتنەکە دانیشتبوو، پێی وت: دوام کەوە، ئەویش بێ قسەکردن هەستا و دوای کەوت ... عیسا ئەگەڕا بە شارو لادێکانا لە شوێنی کۆ بونەوەی جولەکەکانا خەڵکی فێر ئەکرد و مزگێنی پادشایەتی ئاسمانی ئەدا. هەموو دەردو نەخۆشیەکی چاك ئەکردەوە..[2].

- بەشی دەیەم:

ئینجا دوانزە قوتابیەکەی بانگ کرد، توانای دانێ بەسەر ڕۆحە پیسەکانا کە دەریان کەن، هەموو نەخۆشی و دەردێك چاك بکەنەوە، ناوی دوازدە نێراوەکە ئەمانەن: شەمعون بە پەترۆس ناو ئەبرا، ئەندۆراسی برای، یاقوب کوڕی زەبدی و یۆحننای برای، فیلیپۆس، برتۆلماوس، تۆما مەتای باجگر، یاقوبی کوڕی حەلفا تەداوس، شەمعونی قانەوی و یەهوزای ئەسخەریوتی، ئەوەی عیسای دا بە دەستەوە..[3].

---

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی هەشتەم: بڕگەی: ١ـ ٣.

[2] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی نۆیەم: بڕگەی: ٩ ، ٣٥.

[3] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی دەیەم: بڕگەی: ١ـ ٤.

لەم بەشەشدا عیسا ئامۆژگاری هەر دوانزدە قوتابیەکەی کرد هەندێ ڕێ نموپی پێدان لەسەر چۆنیەتی بانگەواز و ئامۆژگاری کردنی خەڵك ..

- بەشی یانزدەیەم:

هەر کە عیسا لە ئامۆژگاری دوانزە قوتابیەکەی تەواو بوو، لە وێ ڕۆیشت، چوو بۆ فێر کردن و مزگێنی دان لە شارەکانی تردا، کاتی یۆحەننا لە بەندیخانەدا ئەو کارانەی عیسای بیست، هەندێ لە قوتابیەکانی ناردە لای، لێیان برسی: ئایا تۆی ئەوەی چاوەڕێ ئەکرێت وەێی، یان چاوەڕێی یەکێکی کە بکەین؟ عیسا وەڵامی دانەوە وتی: بڕۆن ئەوەی بیستوتانە و بینیوتانە بە یۆحەننا بڵێن... شەریعەت و نێراوانی خودا هەموو باسی هاتنی یۆحەننایان کردووە، ئەگەر باوەڕ ئەکەن، ئەم یۆحەننایە ئەو ئیلیایەیە کە گەڕانەوەی چاوەڕێ ئەکرێت، ئەوەی گوێی هەیە با گوێ بگرێ ..[1].

- بەشی دوانزەهەم:

لەڕۆژی شەمەدا کاتێ عیسا بە نێوان دەغڵەکانا تێ ئەپەڕی، قوتابیەکانی برسیان بوو، دەستیان کرد بە گوڵەگەنم پرواندن و خواردنی، کە فەریسیەکان ئەمەیان دی پێیان وت: ئەوەتا قوتابیەکانت کارێك دەکەن لە ڕۆژانی شەمەدا دروست نیيە، عیسا وەڵامی دانەوە وتی: ئەی نەتان خوێندۆتەوە کە داود ئەوانەی لەگەڵیا بوون چیان کرد کاتێ برسیان بوو؟ چۆن چوونە پەرستگاکە و نانی پەرستگاکەیان خوارد، ئەو نانەی دروست نەبوو بخورێ، نە لە لایەن ئەوەوە، نە لە لایەن ئەوانەی کە لەگەڵیا بوون. تەنها لە لایەن کارکەرانی پەرستگاکەوە نەبێ بەڵام من پێتان ئەڵێم ئا ئێرە مەزنترە لە پەرستگا، ئەگەر مانای وتەکان تێ

---

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی یانزدەهەم: بڕگەی: ١ ـ ٥، ١٢ـ ١٦.

بگەیشتنایە من داوای بەزەیی ئەکەم نەك قوربانی ئاوا بڕیارتان نەئەدا بەسەر ئەوانەی بێ تاوانن، کوڕی مرۆڤ خۆی گەورەی ڕۆژانی شەمەیە.. کاتێ فەریسیەکان، چوونە دەرەوە، تەگبیریان لێ کرد کە لەناوی بەرن، عیسا بەمەی زانی و لەوێ ڕۆیشت، خەڵکێکی زۆر دوای کەوتن هەموو ئەوانەی نەخۆش بوون چاکی کردنەوە...[1].

- **بەشی سیزدەهەم:**

**(لەم بەشەدا سەرزەنشتی جولەکەکان دەکات..)**

قوتابیەکان هاتنە پێشەوەو پێیان وت: بۆچی وا بە نموونە قسەیان بۆ دەکەیت؟ عیسا وەڵامی داینەوە وتی: لەبەرئەوەی بە ئێوە دراوە کە نهێنی پاشاهێتی ئاسمان بزانن، بەڵام بەمان نەدراوە، ئەوەی ئەیەوێ تێ بگات، زیاتر تێ گەیشتنی پێ ئەدرێ ئەوەشی هەوڵی تێ گەیشتن نادات، ئەوەی هەیەتی لێی ئەسەنرێتەوە. لەبەر ئەمە بە نموونە قسەیان بۆ ئەکەم، ئەوان سەیر ئەکەن بێ ئەوەی ببینن، گوێ ئەگرن بێ ئەوەی ببیسن و تێ بگەن، وتەی ئەشعیای نێراوی خودا بەسەریان ئەچەسپێ، ئەوەی کە ئەڵێ: ئەبیستن بەڵام تێ ناگەن، سەیر ئەکەن بەڵام نابینن، چونکە دڵی ئەم گەلە بەتەواوی ڕەق بووە، گوێیان قورس بووە، چاویان نوقاندووە، نەوەك بەچاویان ببینن، بە گوێیان ببیسن، نەوەك بەدڵیان تێ بگەن، و پەشیمانبنەوە لە گوناهەکانیان، ئەوسا منیش یارمەتیان بدەم، بەڵام ئێوە خۆزگە بە چاوتان لەبەر ئەوەی.ئەبینن، خۆزگە بە گوێتان چونکە ئەبیسن..[2]. بەم چەشنە عیسا لەم بەشەدا بە نمونە و پەند ئامۆژگاریان دەکات ..

---

[1] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی دوانزدەهەم: بڕگەی: ١ـ ٤، ٦ ـ٨، ١٤، ١٥.

[2] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی سیازدەهەم: بڕگەی: ١٠ ـ ١٦.

- **بەشی چواردەهەم:**

کاتێ هێرۆدس لەو سەردەمەدا حوکمڕانی ئەو ناچەیە بوو، دەنگ وباسی عیسای بیستەوە، بە پیاوەکانی وت: ئەوە یۆحەننا ئاوهەڵکێشەو لەناو مردوانا زیندوبۆتەوە، بۆیە کاری وا سەرسوڕهێنەر ئەکرێ لەسەر دەستی، کاتی خۆی، هێرۆدس یۆحەننای بەدیل گرت، زنجیر بەستی کرد وفڕێی دایە ناو بەندیخانەوە. ئەمەش لەبەر هێرۆدیای ژنی فیلۆپسی برای، چونکە یۆحەننا بە ئاشکرا بە هێرۆدسی وت: ئەمە راست نیە کە تۆ ژنی براکەت داگیر کەیت. هێرۆدس ئەیویست یۆحەننا بکوژێ و لە ناوی بەرێ، بەڵام ئەترسا لەو خەڵکەی ئەوێ، چونکە خەڵکەکە یۆحەننایان بە چاوی نێراوی خوداوە سەیر ئەکرد. لە کاتی ئاهەنگ گێڕانا، بە بۆنەی جەژنی لە دایك بوونی هێرۆدسەوە، کچی هێرۆدیا هەستاو لە ناوەراستی خەڵکەکەدا دەستی کرد بەسەما کردن، هێرۆدس ئەمەی زۆر پێخۆش بوو، سوێندی بۆ خواردو پەیمانی دایە ئەوەی کە داوای بکات بۆی جێ بەجێ بکات و بیداتێ، کچە دوای ئەوەی راوێژی بەدایکی کرد وتی: لێرە لەسەر سینیەك سەری یۆحەننام بەرێ، هێرۆدس ئەمەی پێناخۆش بوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشا فەرمانی دا بیدەنێ ئەوەی ئەیەوێت، لەبەر ئەوەی لەبەردەمی ئەو خەڵکەی کە لە وێدا بوون پەیمانی دابوو، بە فەرمانی ئەو چوونە بەندیخانە، سەری یۆحەننایان بڕی و لە سەر سینیەك پێشکەشی کچەکەیان کرد، ئەویش وەری گرت و بردی بۆ لای دایکی، لە دواییدا قوتابیەکانی یۆحەننا هاتن لاشەکەیان هەڵگرت و ناشتیان، ئینجا چوون بۆ لای عیسا هەواڵیان دایە...[1].

---

[1] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی چواردەهەم: برگەی: ١ ـ ١٢.

- **بەشی پازدەهەم:**

ئینجا خەڵکەکەی هەموو بانگ کرد و پێی وتن: گوێ بگرن و تێ بگەن، ئەوەی ئەچێتە ناو دەمەوە، مرۆڤ پیس ناکات بەڵکو ئەوەی کە لەدەم دێتە دەرەوە، ئەوە مرۆڤ پیس ئەکات، قوتابیەکان هاتنە پێشەوە و پێیان وت: ئەزانی ئەم قسەیە فەریسیەکانی زۆر بێزار کرد، وەڵامی دانەوە هەر ڕووەکێك باوکی ئاسمانیم نەی چاندبێت، ئەبێ هەڵکەنرێ، وازیان لێ بێنن، ئەوانە کوێرن ئەیانەوێ ڕێگا پیشانی کوێربەن .. پەترۆس پێی وت: ئەم نمونەیەمان بۆ ڕوون بکەرەوە. عیسا لە وەڵامدا وتی: ئایا ئێوەش تێ ناگەن؟ نازانن ئەو خواردنەی ئەچێتە ناو دەمەوە، ئەڕواتە ناو سك و دوایی فڕێ ئەدرێتە دەرەوە، بەڵام ئەوەی لە دەم دێتە دەرەوە لە دڵایە و ئەوەشە کە مرۆڤ پیس ئەکات، بیری خراپ لە ناوەوە هەڵ ئەقوڵێ بۆ دەرەوە، کوشتن، داوێن پیسی، بەدکاری، دزی، شایەتی درۆ، کفر کردن، ئا ئەمانەن کە مرۆڤ پیس ئەکەن...[1].

- **بەشی شازدەهەم:**

عیسا لە وکاتەوە دەستی کرد بە دەرخستنی ئەوەی پێویستە، وە ئەبێ بڕوا بۆ ئۆرشەلیم، ئازار بدرێ بە دەستی گەورە پیاوان، وەسەرۆکی پەرستگاکانی جولەکە وشەریعەت نوسراوەکان، ئینجا بکوژرێ و لە ڕۆژی سێهەمدا زیندوو ببێتەوە، پەترۆس عیسای هێنایە ئەم لاوەو پێی وت: کاری وات لێ دور بێت و هەرگیز ئەمەت بەسەر نەیەت. عیسا ئاوڕی دایەوە و بە پەترۆسی وت: ون بە لەبەر چاوم ئەی شەیتان ئێستا تۆ گیروگرفتی لە بەردەمما، .چونکە هێشتا بیرت لای شتی مرۆڤانەیە، نەك لای کاری خودایی. ئینجا عیسا بە قوتابیەکانی وت: ئەوەی ئەیەوێ

---

[1] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی پازدەهەم: بڕگەی: ١٠ ـ ١٩.

دوام کەوێت، با واز لە خۆی بێنێت و خاچی خۆی هەڵگرێ و دوام کەوێت، ئەوەی دەست بە ژیانەوە بگرێ ژیان ئەدۆڕێنێت، بەڵام ئەوەی ژیانی خۆی بدۆڕێنێت لەبەر من ژیان ئەباتەوە، چی بەکەڵکی مرۆڤ دێت، گەر هەموو دنیا بەرێتەوە بەڵام ژیان بدۆڕێنێت، هیچ شتێك نییە لەسەر ئەم زەویە گران بەهاتر بێت لە ژیانی هەتا هەتای...[1].

- **بەشی حەڤدەهەم:**

دوای ئەمە بەشەش ڕۆژ عیسا پەترۆس و یاقوب و یۆحەننای برای لەگەڵ خۆیا برد و بەیەکەوە چونە سەر چیایەکی بەرز ، کاتێ لە بەر چاویان بەتەواوی خۆی دەرخست، دەم و چاوی بریسکەی دایەوە وەك بریسکەو تیشکی ڕۆژ، جلەکانی سپی بوو وەك ڕووناکی، لە پڕ موسای نێراوی خودا لەگەڵ ئەلیاس نێراوی خودا دەرکەوتن وهەردوو کیان لە گەڵی دوان لەکاتێکدا کە عیسا و قوتابیەکانی بە ناوچەی جەلیلا ئەگەڕان، عیسا بە قوتابیەکانی وت: کوڕی لە مرۆڤ لەدایك بوو، ئەوەندەی نەماوە بدرێ بە دەستی خەڵکەوە، بیکوژن وە لە ڕۆژی سێیەما زیندوبێتەوە جا قوتابیەکان بەمە زۆر دڵگران بوون..[2].

- **بەشی هەژدەهەم:**

لەو کاتەدا قوتابیەکان هاتنە لای عیسا لێیان پرسی: کەواتە کێ گەورەیە لە پادشایەتی ئاسمانا؟ عیسا منداڵێکی بچووکی بانگ کرد وە لە ناوەڕاستیاندا ڕای گرت، وتی: ڕاستیان پێ بڵێم گەر نەگۆڕێن و نەبنەوە بە منداڵێکی بچووك، هەرگیز ناچنە پادشایەتی ئاسمانەوە، ئەوەی توانی وەك ئەم مناڵە خۆی بە بچووك ڕاگرێ،

---

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی شازدەهەم: بڕگەی: ٢١ ـ ٢٦.

[2] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی حەڤدەهەم: بڕگەی: ١ ـ ٣، ٢٢ ، ٢٣.

له پادشایەتی ئاسمانا بە گەورە دائەندرێ، ئەوەش بە ناوی منەوە ڕێز لە یەکێ بگرێ کە خۆی بە بچووك ڕاگرتووە، منی ئەوێ..[1].

- بەشی نۆزدەهەم:

هەندێ لە فەریسیەکان هاتنە لای عیسا بۆ ئەوەی تاقی بکەنەوە، لێیان پرسی: دروستە پیاو ژنەکەی لە سەر هەر هۆیەك بێت تەڵاقی بدات؟ عیسا وەڵامی دایەوە وتی: ئەی نەتان خوێندۆتەوە لە پەرتوکی پیرۆزا، کە دروستکەر لە سەرەتاوە مرۆڤی بە نێر ومێ دروست کردووە؟ ئەوسا پێی وتن: لەبەر ئەوە پیاو دایك وباوکی خۆی بە جێ ئەهێڵێت، لەگەڵ ژنەکەی جوت ئەکرێت و هەر دووکیان ئەبنە یەك لەش، ئیتر دوو نین بەڵکو یەك لەشن، ئەوەی خودا بەیەکی گەیاندوە، مرۆڤ جیای ناکاتەوە، دیسان لێیان پرسی: ئەی بۆچی موسا ڕای سپاردووە کە تەڵاق نامە بەژن بدرێت و تەڵاقی بکەوێت؟ لە وەڵامدا وتی: لەبەر دڵ ڕەقیتان موسا ڕێی دان کە ژنەکانتان تەڵاق بدەن، بەڵام لەسەرەتاوە ئەم کارە وانەبوو، سەیرکەن من پێتان ئەڵێم: ئەوەی ژنەکەی بێ هۆی داوێن پیسی تەڵاق ئەدات و یەکێکی تر ئەهێنێت، ئەوە داوێن پیسی ئەکات، ئەوەش تەڵاق دراوێك ئەهێنێت داوێن پیسی ئەکات. ئینجا قوتابیەکان پێیان وت: ئەگەر وا بێت باری ژن ومێردایەتی، کەواتە ژن نەهێنان و شوونەکردن باشترە! وەڵامی دانەوە: ئەم وتەیە هەموو خەڵکی دانی پیانانێن، تەنها ئەوانە نەبێت کە خودا یارمەتی داون بەمە ڕازی بن...کوڕێکی گەنج هاتە لای و پرسی: ئەی مامۆستا چ چاکەیەك بکەم تاکو ژیانی هەتا هەتایی بەدەست بێنم؟ وەڵامی دایەوە: بۆچی لەبارەی چاکەوە پرسیارم لێدەکەیت؟ چاکە هەریەکێکی هەیە، بەڵام ئەتەوێ بچیتە ناو ژیانی بێ مردنەوە بە ڕاسپاردەکانی

---

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی هەژدەهەم: بڕگەی: ١ ـ ٥.

شەریعەت کار بکە. ئەویش لێی پرسی: چ ڕاسپاردەیەك: عیسا وەڵامی دایەوە: مەکوژە، داوێن پیسی مەکە، مەدزە، شایەتی درۆ مەدە، ڕێزی داك وبابت بگرە، کەسانیترت وەك خۆت خۆش بوێ...[1].

- **بەشی بیستەم:**

کاتێ عیسا بەرەو ئۆرشەلیم ئەڕۆا، هەر دوازدە قوتابیەکەی لەڕێگا جیاکردەوە، پێی وتن: ئەوا ئێمە ئەڕۆین بۆ ئۆرشەلیم کە کوڕی مرۆڤ تیایا ئەدرێتە دەست سەرۆك قەشەکان و شەریعەت نوسەکان، بڕیاری مردن بەسەریا ئەدەن، ئەیدەنە دەست گەلان گاڵتەی پێ ئەکەن و بە قامچی لێی ئەدەن لە خاچی ئەدەن، بەڵام لە ڕۆژی سێیەمدا زیندو دەبێتەوە..[2]. ئەم بەشە زۆربەی پەند ونمونەو و ئامۆژگاریە.

- **بەشی بیست و یەك:**

ئینجا عیسا چووە گۆڕەپانی پەرستگاکەوەو هەموو ئەوانەی خەریکی کڕین وفرۆشتن بوون، دەری کردن دەزگاو جێگای دانیشتنی پارە گۆڕەوەکان و کۆتر فرۆشانی سەرو ژێر کرد، پێی وتن: نوسراوە ماڵەکەم بە ماڵی نوێژ ناو ئەبرێ، بەڵام ئێوە کردوتانە بە ئەشکەوتی دزان، کاتێ لە پەرستگاکەدا بوو، کوێرو شەل لێی هاتنە پێشەوە ئەویش چاکی کردنەوە. کاتێ سەرۆك قەشەکان و نوسەرانی شەریعەت ئەم سەرسوڕ هێنەرەیان دی ڕقیان هەڵسا، گوێیان لە منالآنی ناو پەرستگەکە بوو هاواریان ئەکرد: ستایشمان بۆ کوڕی داود. جا لێیان پرسی: گوێت لێیە ئەوانە چی دەڵێن؟ عیسا وەڵامی دانەوە: بەڵێ نەتان خوێندۆتەوە کە لەسەر زاری منالآن و شیرە خۆران ستایش ڕێکخراوە..[3].

---

[1] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی نۆزدەهەم: برگەی: ٣ ـ ١١ ، ١٦ ـ ١٩.

[2] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیستەم: برگەی: ١٧ ـ ١٩

[3] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیست ویەك: برگەی: ١٢ ـ ١٧.

- **بەشی بیست دوو:**

ئینجا فەریسیەکان ڕۆیشتن و تەگبیریان کرد، کە چۆن بەهۆی قسەی خۆیەوە تووشی کەن. چەند کەسێکی خۆیان لەگەڵ پیاوانی هێرۆدسا ناردە لای پێی بڵێن: مامۆستا ئەزانین کە تۆ ڕاستگۆیت و بەڕاستی خەڵکی فێری ڕێگای یەزدان ناسی دەکەیت، لە کەس سڵ ناکەیتەوە، چونکە پلە وپایە نرخی نییە لات، کەواتە دروستە سەرانە بدرێ بە قەیسەر یان نا؟ عیسا بە فێڵەکەیانی زانی و وتی: ئەی ساختەچیان بۆچی تاقیم ئەکەنەوە؟ ئا پارەیەکی ئەو سەرانەیەم بدەنێ، ئەوانیش دینارێکیان دایە. لێی پرسین: ئەم وێنەو نیگارە هی کێیە؟ وتیان هی قەیسەرە. ئینجا پێی ووتن: کەواتە ئەوەی هی قەیسەرە بیدەن بە قەیسەر ئەوەشی کە هی خودایە بیدەن بە خودا، ئیتر بە جێیان هێشت و ڕۆشتن بەسەرسامی، لەوەی گوێیان لێبوو..[1]

- **بەشی بیست وسێ:**

عیسا لەگەڵ خەڵکەکەو قوتابیەکانیا دواو وتی: ئەوەتا نوسەرانی شەریعەت و فەریسیەکان چونەتە سەر کورسیەکەی موسا ئەوی پێتانی ئەڵێن کاری پێ بکەن، بەڵام ئەوە مەکەن کەئەوان ئەی کەن، لە بەر ئەوەی باسی شەریعەتتان بۆ ئەکەن بەڵام کاری پێناکەن، باری قورس و ئەوەی لە تواناادا نییە ئەی پێچنەوە و ئەیخەنە سەر شانی خەڵکی، بەڵام خۆیان نایانەوێ پەنجەیان بەری بکەوێت .... بەڵام خاك بەسەرتان ئەی نوسەرانی شەریعەت فەریسیانی دوو ڕوو، چونکە دەرگای پادشاهی ئاسمان بە ڕووی خەڵکیدا دائەخەن، نە خۆتان ئەچنە ژوورەوە، نە ئەهێڵن خەڵکێکی کە بچێت. خاك بەسەرتان ئەی نوسەرانی شەریعەت وفەریسیانی دوو ڕوو ئێوە ماڵی بێوەژن ئەخۆن، بە خۆڕایی درێژە ئەدەن بە نوێژەکانتان و ئەپاڕێنەوە..[2].

---

[1] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیست ودوو: برگەی: ١٥ ـ ٢٢.

[2] بنوارە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیست سێ: برگەی: ١ ـ ٤ ، ١٣، ١٤.

- **بەشی بیست و چوار:**

ئینجا نیشانەی کوڕی مرۆڤ لە ئاسمانا دەر ئەکەوێ، هەموو خێڵەکانی سەر زەمین دەست ئەکەن بە گریان، جا کوڕی مرۆڤ لە دایك بوو ئەبینن، لەسەر هەوری ئاسمانەوە بە هێز و شکۆیەکی مەزنەوە دێت. فریشتەکانی بەکەڕەنایەکی گەورەوە بە هەر چوار لادا ئەنێرێ تاکو هەڵبژێراوانی لەم سەرو ئەوسەری ئاسمانەوە کۆ بکەنەوە، ئەم نمونەیە لەدار هەنجیرەوە فێربن، کاتێ لقەکانی نەرم بوون گەڵایان دەرکرد، ئەوا ئەزانرێ هاوین نزیك بۆتەوە. هەروەهاش کە ئەم شتانەتان هەموو بینی ڕوو ئەدات بزانن هاتنەوەی ئەو نزیکە بەڵکو لەبەر درگایە، ڕاستیتان پێ ئەڵێم: ئەم نەوەیە لە ناو ناچێ هەتا ئەم شتانە هەمووی ڕوو نەدات، ئاسمان وزەوی لە ناوئەچن، بەڵام وتەکانم هەر گیز لە ناو ناچن، ئەو ڕۆژ و ئەو کاتە کەس نای زانێ، نە فریشتەکانی ئاسمان نە کوڕ تەنها باوکم ئەیزانێ..[1].

- **بەشی بیست و پێنج :**

کاتێ کوڕی لە مرۆڤ لەدایك بوو لەگەڵ فریشتەکانیا بە شکۆوە ئەگەڕێتەوە، دا ئەنیشێ لەسەر تەختی شکۆی خۆی، هەموو نەتەوەکان کۆ دەبنەوە لەبەردەمیا، هەندێکیان لەوی کەیان جیائەکاتەوە، وەك جیاکردنەوەی مەڕو بزن، مەڕەکان لەلای ڕاستی خۆیەوە ڕائەگرێ و بزنەکانیش لەلای چەپیەوە، ئینجا پادشا بەوەی لای ڕاستیەوەن ئەڵێ: وەرن ئەی ئەوانەی باوکم پیرۆزی کردون، وەریگرن ئەو پادشایەتیەی لە دروست کردنی جیهانەوە بۆتان ئامادەکراوە...دوای ئەوە بەوانەی لەلای چەپەوە ڕاواستاون ئەڵێت: دوور کەونەوە لێم ئەی نەفرەت لێ کراوینە بۆ دۆزەخی هەتا هەتایی ئەوەی بۆ شەیتان و دەست و پێوەندی ئامادە کراوە..[2].

---

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیست و چوار: برگەی: ٣٠ ـ ٣٦.

[2] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیست و پێنج: برگەی: ٣١ ـ٣٥ ، ٤١.

- **بەشی بیست و شەش:**

کاتێ عیسا ئەم ووتانەی هەموو تەواو کرد، بە قوتابیەکانی وت: ئێوە ئەزانن کە دوو ڕۆژی کە جەژنی فەتیرە دێت، ئەوسا کوڕی لە مرۆڤ لە دایك بوو، ئەدرێ بەدەستەوە تاکو لە خاچ بدرێ ... ئەو کاتە یەکێ لە دوازدە قوتابیەکەی کە ناوی یهوزای ئەسخەریوتی بوو ڕۆشت بۆ لای گەورەی قەشەکان، وتی: چەند ئەدەن پێم تا بیدەمە دەستتان؟ ئەوانیش سی دراوی زیویان بۆ دانا، جا لەو کاتەدا یەهوزا ئەگەڕا بۆ هەلێك کە بیدا بەدەستەوە...لە کاتی نان خواردن عیسا نانێکی هەڵگرت پیرۆزی کرد، پارچە پارچەی کرد و دای بە قوتابیەکان و وتی: بگرن بخۆن ئەمە لەشی منە، ئینجا جامی هەڵگرت سوپاسی یەزدانی کرد، دای پێیان و وتی: بخۆنەوە هەموو لێی چونکە ئەمە خوێنی منە بۆ پەیمانی نوێ، ئەو خوێنەی لە پێناوی کەسانی زۆرا ئەڕژێ بۆ تاوان بەخشین. پێتان ئەڵێم: من لەم ڕۆ بەدواوە لە بەرووبوومی ڕەز ناخۆمەوە، تا ئەو ڕۆژە دێت کە سەر لە نوێ لە پادشایەتی باوکما لەگەڵتانا ئەخۆمەوە .. جا لە هەمان کاتدا عیسا پێی وتن: ئەمشەو هەموتان لە من ئەکەونە گومانەوە چونکە نوسراوە لە شوانەکە .ئەدەم، جا مەڕی مێگەلەکە بڵاو ئەبنەوە، بەڵام ئەوە بزانن دوای زیندوبونەوەم پێشتان ئەکەوم بۆ ناوچەی جەلیل، پەترۆس وەڵامی دایەوە گەر هەموو لێت بکەونە گومانەوە من گومانت لێ ناکەم، عیسا پێی وت: بەڕاستی پێت بڵێم ئەمشەو تۆ پێش ئەوەی کەڵەشێر بخوێنێ سێ جار دەری ئەبڕی کە گوایە هەر نام ناسیت. پەترۆس وتی: گەر لەگەڵتا مردووم ئەوە ناکەم! هەروەها قوتابیەکان هەموو لەم قسانەیان کرد عیسا گەڕایەوە بۆلای قوتابیەکانی وتی: ئێستا بخەون پشووبەن! ئەوەتا کاتی ئەوە نزیك بۆتەوە کە کوڕی مرۆڤ لە دایك بوو بدرێتە دەست تاوان باران. هەستن با بڕۆین ئەوا نزیك

بوەوە ئەوەی ئەمدات بەدەستەوە. لەو کاتەی ئەدوا، یوهوزا کە یەکێك بوو لە دوازدە قوتابیەکانی، لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر بە شیر و کوتەکەوە گەیشتنە ئەوێ، ئەمانەش ئەوانە بوون کە لەلایەن سەرۆك قەشە و پیرانی گەلەوە نێرابوون، ئەوەی عیسا ئەدا بەدەستەوە نیشانەیەکی دابونێ، پێشیانی وتبوو: ئەوەی ماچی ئەکەم خۆیەتی بیگرن. لە عیسا نزیك بووە وتی سڵاو ئەی مامۆستا ئینجا بە گەرمی ماچی کرد ئەوسا عیسا وتی ئەی دۆستی من تۆ ئەزانی چی ئەکەیت؟ ئینجا ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە عیسا هاتنە پێشەوە و گرتیان. یەکێ لەوانەی لەگەڵ عیسادا بوو دەستی بۆ شیرەکەی درێژ کرد دەری هێنا و لە یەکێ لەدەستە وپێوەندەکانی سەرۆك قەشەکانیداو گوێی بڕی، عیسا پێی وت: شیرەکەت بگەێرێنەوە ناو کێلانەکەی خۆی، چونکە ئەوانەی شیر دەوەشێنن بەشیر لەناو ئەچن، ئایا وا ئەزانی کە نا توانم داوا لە باوکم بکەم دوازدە لەشکر فریشتەم بۆ بنێرێت؟ بەڵام چۆن بێتەدی ئەوەی لە پەرتوکی پیرۆزا نووسراوە لەبارەی ئەمەی ئێستا ڕوودەدات، وەئەڵێت پێویستە ڕوو بدات. ئینجا عیسا وتەکانی ئاراستەی خەڵکەکە کرد و وتی: هەروەك چۆن بەشیرو کوتەکەوەئەچن بۆ دزێ ئاوها ئەتانەوێ بمگرن؟ هەموو ڕۆژ لە نێوانتانا بووم، لەپەرستگاکە خەریکی فێرکردن بووم، کەچی نەتان ئەگرتم! بەڵام ئەمانە هەمووی ڕووی دا، هەتا بێتە دی پەرتوکی نێراوانی یەزدان، لەو کاتەدا قوتابیەکانی هەموو بەجێیان هێشت و ڕایان کرد. ئەوانەی عیسایان دەست بەسەر کرد، بردیان بۆلای قەیافا کە گەورەی قەشەکان بوو، لەو کاتەشدا شەریعەت نوسەکان و پیران لای کۆبووبوونەوە، پەترۆس دوور بەدوور دوایان کەوت بۆ ماڵی قەشەکان ئینجا چووە ژوورەوە لەناو پاسەوانەکاندا دانیشت تا بزانێت چی ئەبێت، ئەنجومەنی باڵای جولەکە بە ئامادەبوونی سەرۆك قەشەکان وپیران هەموو

کۆبوونەوە، گەڕان بۆ ئەوەی بەدرۆ تاوانێ بخەنە پاڵ عیسا، تاکو بڕیاری مردنی بەسەردا بدەن. بەڵام هیچی وایان نەدۆزیەوە، زۆر لەوانەی کە بەدرۆ تاوانیان ئەخستە پاڵ عیسا ئامادە بوون لەوێ. لە دواییدا دوان هاتنە پێشەوە وتیان: ئەمە وتی ئەتوانم پەرستگای خودا بڕوخێنم ولە ماوەی سێ ڕۆژدا دروستی بکەمەوە. لەوێ گەورەی قەشەکان هەڵساو لێی پرسی: ئایا وەڵامت چیە دەربارەی ئەم دوانە پێت ئەڵێن؟ بەڵام عیسا بە بێ دەنگ مایەوە.دیسانەوە گەورەی قەشە پرسیاری لێکردەوە وتی: سوێندت ئەدەم بە خودای زیندوو ئایا مەسیحی کوڕی خودا تۆیت؟ عیسا وەڵامی دایەوە: خۆت وتت، هەروەها پێشتان ئەڵێم: لە ئێستاوە کوڕی لە مرۆڤ لەدایك بوو ئەبینن لەلای ڕاستی خوداوە دائەنیشێت، ئینجا لەدواییدا لەسەر هەوری ئاسمانەوە ئەبیندرێ کەدێت. گەورەی قەشەکان کراسی خۆی دادڕی و هاواری کرد: ئەوەتا کفر ئەکات پێویستمان بە شایەت نییە ئا ئەوەتا گوێتان لە کفرەکەی بوو، ڕاتان چیە؟ وەڵامیان دایەوە شایانی مردنە. ئینجا تفیان لە ڕووی کردو لێیان دا. هەندێکیان بە زللە لێیاندا ئەیان وت: ها ئەی مەسیح پێمان بڵێ کێ بوو لێی دایت؟ لەو کاتەدا پەترۆس لە حەوشەی خانوەکەدا دانیشتبوو، یەکێ لەکارەکەرەکانی ئەوێ هاتە لای پێی وت: تۆش لەگەڵ عیسای جەلیلی بوویت؟ پەترۆس دانی بەمەدا نەناو وتی من نازانم تۆ چی ئەڵێت! ئینجا پەترۆس چووە لای دەروازەی خانوەکە کارەکەرێکی تریش ناسیەوە بەوانەی لە وێ بوون وتی: ئەمەش لەگەڵ عیسای ناسری بوو، بۆ جاری دووەم پەترۆس دانی بەمەدا نەنا وسوێندی خوارد: من ئەو پیاوە ناناسم، دوای ماوەیەك ئەوەی لەوێ ڕاوەستا بوون لە پەترۆس هاتنە پێش و پێیان وت: لە ڕاستیا تۆ یەکێکی لەوان، شێوەی قسەکردنت ئەوە دەردەخات. پەترۆس دەستی کرد بە ناڕەزایی دەربڕین و سوێند خواردن و

وتی: من ئەو پیاوە ناناسم، دوای ئەمە دەست بەجێ کەڵەشێری بەیانی خوێندی، ئەوساکە پەترۆس قسەکانی عیسای بیرکەوتەوە، کە وتی: پێش ئەوەی کەڵەشێر بخوێنێ سێ جار دەری ئەبڕی کە تۆ من ناناسی. ئینجا چووە دەرەوە گریانێکی بە کوڵ گریا[1].

- **بەشی بیست وحەوت:**

کاتێ ڕۆژ بووە وە، سەرۆکی قەشەکان و پیرانی گەل کۆبونەوەیەکی تریان کرد، تەگبیریان کرد بڕیاری کوشتن بۆ عیسا دەرکەن، جا بە دەستی بەستراوی بۆ لای پیلاتۆسی فەرمانڕەوایان برد .. کاتێ یەهوزا ئەوەی کە دابووی بەدەستەوە بینی وافەرمان بەسەر عیسادا درا، پەشیمان بوەوە، سی پارچە زیوەکەی بۆ سەرۆکی قەشەو پیران گەڕانەوە، وتی: هەڵەم کرد کاتێ بێ تاوانێکم دا بەدەستەوە، وەڵامیان دایەوە وتیان: ئەمە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە خۆتەوەیە، ئینجا یەهوزا پارچە زیوەکانی لەپەرستگاکەدا فڕێداو ڕۆی، دوای ئەوە چوو خۆی هەڵواسی و خۆی خنکاند، سەرۆکی قەشەکان پارچە زیوەکانیان هەڵگرتەوەو وتیان: ئەمە نرخی خوێنە ناشێ بۆمان بیخەینە گەنجینەی پەرستگاوە.. عیسا بەرامبەری پیلاتۆسی فەرمانڕەوا وەستا، فەرمانڕەوا لێی پرسی: ئایا تۆیت پادشای جولەکە؟ وەڵامی دایەوە وتی: خۆت وتت. هەر لەوکاتەشدا سەرۆکی قەشەو پیران تاوانیان ئاراستەی کرد و ئەویش بێ دەنگ بوو بێ وەڵام دانەوە. پیلاتۆس وتی: ئایا نابیستیت چی دژت ئەوترێ، بەڵام عیسا هیچ وەڵامێکی نەداوە، فەرمانڕەواکە لەمە زۆر سەرسام بوو. فەرمان ڕەوا کردبویە پیشە، هەموو جەژنێ دیلێك لەوانەی کە گەل خۆی هەڵی ئەبژێرێ ئازادی بکا. لەو کاتە دیلێکی بەناوبانگ لایان بوو، ناوی باراباس بوو، کاتێ خەڵکەکە کۆبونەوە

---

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیست و شەش: بڕگەی: ١، ٢، ١٤ ـ ١٦ ، ٢٦ ـ ٣٠، ٣٣ ـ ٣٥، ٤٥ ـ ٧٥.

پیلاتۆس لێی پرسین: کێتان ئەویٚ بۆتان ئازاد بکەم، باراباس یا عیسا ئەوەی پێی ئەوتریٚ مەسیح؟ چونکە ئەیزانی کەلە ڕقا داویانە بەدەستەوە. دیسان پیلاتۆس پرسیەوە: ئەتانەویٚ کام لەم دوانە ئازاد بکەم؟ وەلأمیان دایەوە باراباس. ئینجا پرسی: ئەی چی لە عیسا بکەم کە بە مەسیح ناو ئەبریٚ؟ هەموویان وەلأمیان دایەوە با لەخاچ بدریٚ. فەرمانڕەوا پرسیاری کرد: چ خراپەیەکی کردووە؟ زیاتر هاواریان کرد با لەخاچ بدریٚ. کاتیٚ پیلاتۆس بینی کەسوودی نییە و خەریکە ئاژاوە دروست ئەبیٚ، ئاوی هێنا لەبەردەمیانا دەستی شت و وتی: من بیٚ تاوانم لە خوێنی ئەم بیٚ تاوانە، خۆتان ئەم کارە جیٚ بەجیٚ بکەن، گەل هەموو وەلأمیان دایەوە: باخوێنی لەسەر خۆمان و منالْمان بیٚ. ئینجا ئەویش باراباسی بۆ ئازاد کردن، بەلأم عیسا قامچی لیٚ دراو، درایە دەست سەربازەکان تا لەخاچی بدەن. سەربازەکان عیسایان بۆ خانووی فەرمان داری برد، لەشکریان هەموو لیٚ کۆکردەوە، جلەکانیان لەبەر داکەند، جلێکی سوریان لەبەر کرد بازنەیەکی دڕکیان چنی و لەسەر سەریان دانا، قامیشێکیان دایە دەستی ڕاستی ... دوای ئەوەی بە تەواوی گالْتەیان پیٚ کرد کراسەکەیان لەبەر داکەند و کراسەکەی خۆیان لەبەر کردەوە و بردیان بۆ لە خاچ دان.. هاتوچۆکەران جنێویان پیٚ ئەداو سەریان ڕائەوەشاند و ئەیان ووت: ئەی ڕووخێنەری پەرستگاو دروست کەرەوەی لە سیٚ ڕۆژا خۆت ڕزگار کە! ئەگەر ڕاستە تۆ ڕۆڵەی خودای لە خاچەکە وەرە خوارەوە. سەرۆك قەشەکان و شەریعەت نوسەرەوەکان و پیرانی گەل گالْتەیان پیٚ ئەکرد و ئەیان وت: خەلْکی تری ڕزگار کرد بەلأم ناتوانیٚ خۆی ڕزگار کات! ئایا ئەمەیە پادشای ئیسرائیلە؟ دەبا ئێستا بێتە خوارەوە لە خاچەکە هەموو باوەڕی پیٚ ئەهێنین...لەکاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆوە تا کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ تاریکایی بەسەر هەموو زەویا هات. لە دەوری کاتژمێر سێدا عیسا بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: خودای من، خودای من بۆ وازت لیٚ هێنام؟ کاتیٚ هەندیٚ لەوانەی کە ڕاوەستا بوون گوێیان لەمەبوو، وتیان: ئەو ئیلیا (خودا) بانگ ئەکات. یەکیٚ لەوانە ڕای کرد ئەسفەنجێکی هەلْگرت و

خستيه ناو سركەوە كردى بەسەر قاميشەكەوە ودايە تا بيخواتەوە، بەلام ئەوانى تر وتيان: وازى لێبێنە با بزانين ئيليا دێت رزگارى كات. ئينجا عيسا جارێكى كە هاوارى كردو رۆحى دابەدەستەوە. ئەوسا دەست بەجێ پەردەى پەرستگاكە لە سەرەوە تا خوارەوە دڕاو بوو بە دووبەشەوە، هەموو زەوى لەرزى و بەرد درزى برد لە دورەوە چەند ژنێك سەيريان ئەكرد چى ڕوو ئەدات، ئەمانيش ئەوانە بوون كە لە جەليلەوە لەگەڵ عيسا هاتبوون هەتا يارمەتى بدەن، لە نێوانيانا مەريەمى مەجدەلى و مەريەمى دايكى ياقوب ويوسف، و دايكى هەر دوو كوڕەكەى زەبدەى تيا بوو. كاتێ ئێوارێ داهات پياوێكى دەوڵەمەند كە ناوى يوسف بوو دانيشتووى شارى ڕامە بوو، وە يەكێ بوو لە قوتابيانى عيسا، چووە لاى پيلاتۆس داواى تەرمى عيساى لێ كرد ئيتر پيلاتۆس فەرمانى دا پێى بدرێتێ، يوسف تەرمەكەى هێناو بە كەتانى پاك پێچاى و لە گۆڕێكى تازەدا كە لە بەرد هەڵكەندرا بوو ناشتى ئينجا بەردێكى گەورەى تلۆر كردەوە بۆ سەر دەمى گۆڕەكەى، جا ئەوێى بە جێ هێشت، هەر لەو ناوە مەريەمى مەجدەلى و مەريەمەكەى تريشى لێ بوو بەرامبەر گۆڕەكە دا نيشتبوون. بۆ ڕۆژى داهاتوو، دواى خۆ ئامادەكردنى شەموان، سەرۆكى قەشەكان و فەريسيان بەيەكەوە چوونە لاى پيلاتۆس، وتيان: گەورەم بيرمان كەوتەوە ئەو گێرەشێوێنە لەكاتێكا زيندوو بوو، وتى: من دواى سێ ڕۆژ زيندو ئەبمەوە، جا فەرمان دەر بكە بۆ ئێشككگرتنى گۆڕەكەى بە چاكى نەوەك ڕۆژى سێيەم قوتابيەكانى بێن و بيدزن، ئەوسا بە گەل بڵێن ئەو لە نێوان مردوانا زيندوبۆتەوە. چونكە گێرەشێوێنى دوايى لە يەكەمى خراپتر ئەبێت، پيلاتۆس وەلامى دانەوە: پاسەوانتان هەيە، برۆن چۆن بەچاكى ئەزانن وا ئێشكى بگرن، ئەوانيش ڕۆشتن و دەركى گۆڕەكەيان باش داخست مۆريان كرد و پاشان پاسەوانيان بەدەورەوە دانا..[1].

- **بەشى بيست وهەشت:**

لە ڕۆژى يەكەمى دواى شەمەدا مەريەمى مەجدەلى و مەريەمەكەى تر گۆڕەكان ئەگەڕان، بومەلەرزەيەكى بەهێز ڕوويدا، فريشتەيەك لەلاى خوداوە هاتە خوارێ، هات و

---

[1] بنوارە: مزگێنى مەتا بەكوردى، بەشى بيست و حەوت: برگەى: ١ ـ٧، ١١ـ ١٨، ٢١ـ ٢٩، ٣١، ٣٩ ـ ٤٢، ٤٥ ـ ٥١، ٥٥ ـ ٦٦.

تلی بە بەردەکە داو لەسەری دانیشت، شێوەی فریشتەکە وەك بروسکە وا بوو، جلەکانی وەك بەفری سپی وا بوو، کاتیَ سەربازەکان ئێشکی گۆڕەکەیان ئەگرت ئەمەیان دی، ترسیان لیَ نیشت و وەك مردویان لیَ هات، فریشتە کە دڵنەوایی دوو ژنەکەی کرد وتی: مەترسن من ئەزانم ئێوە بە شوێن عیسای لە خاچ دراوا ئەگەڕێن، ئەو لێرە نیە چونکە هەستاوەتەوە هەر وەك خۆی وتی: وەرن سەیری ئەو شوێنەکەن ئەو تیایا نێژرا بوو، بەخێرایی بڕۆن هەواڵ بەقوتابیەکانی بدەن کە ئەو لە نێوان مردواندا هەستاوەتەوە، ئەوەتا ئەو پێشتان ئەکەویَ بۆ جەلیل لەویَ ئەیبینن، ئەوا من ئاگادارم کردن، دوو ژنەکە بەخێرایی ڕۆشتن، ترسێکی زۆر و خۆشیەکی زۆریان لەدڵدا بوو ڕایان کرد بۆ لای قوتابیەکان بۆ ئەوەی مژدەیان بۆ بەرن، لەوکاتەدا کە ڕایان ئەکرد بۆ بردنی ئەم هەواڵە خۆشە، عیسا خۆی پێیان گەیشت و وتی: سڵاو ، ئەمانیش چوونە پێشەوە و قاچیان گرت و لەبەردەمیا چۆکیان دادا، عیسا پێی وتن: مەترسن بڕۆن بە براکانم بڵێن با بێن بەدواما بۆ جەلیل، جا لە ویَ ئەمبینن. لەو کاتەدا دوو ژنەکە ئەڕۆشتن چەند پاسەوانێك چوون بۆ ناو شار، ئەوەی ڕووی دابوو بۆ سەرۆکی قەشەکانیان گێڕایەوە، ئینجا سەرۆك قەشەکان وپیران کۆبونەوە تا لەم ڕووداوە بدوێن، پارەیەکی زۆریان دا بەسەربازەکان و پێیان وتن: ئێوە بڵێن لەکاتێکدا ئێمە خەوتبووین قوتابیەکانی عیسا هاتوون و تەرمەکەیان دزیوە، گەر هەواڵەکەش بەفەرمان ڕەوا گەیشت، ئێمە لەسەرتان ئەکەینەوەبەم شێوەیە گیرو گرفتتان بۆ نابیَ. سەربازەکان پارەکەیان هەڵگرت، چیان پیَ وترا کردیان، جا بەم شێوەیە هەواڵەکە بە ناو جولەکەدا بڵاو بۆتەوە تا ئەمڕۆ. ئیتر یازدە قوتابیەکە چوون بۆ ناوچەی جەلیل بۆ ئەو کێوەی کە عیسا بۆی دەستنیشان کردبوون، کاتیَ دیان کڕنوشیان بۆ برد، بەڵام هەندێکیان دوو دڵ بوون، عیسا لێیان نزیك بوەوە وتی: هەموو هێزێکی زەوی و ئاسمانم پیَ بەخشرا، بڕۆن هەموو گەلان فێر کەن لە ئاویان هەڵکێشن بە ناوی باوك و کوڕو ڕۆحی پیرۆزەوە فێریان کەن، با کار بکەن بە هەموو ئەو شتانەی کە پێم ڕاسپاردوون، ئەوەتا من لەگەڵتانام تا کۆتایی جیهان[1].

****************

---

[1] بنواڕە: مزگێنی مەتا بەکوردی، بەشی بیست و حەوت: بڕگەی: ١ ـ ٢٠.

## ناوەڕۆكی كرداری نێراوان

كرداری نێراوان هەروەك مزگێنیەكان پێك هاتووە لە چەند بەشێك، وە هەر بەشەی لە چەند برگەیەك پێك هاتووە، لێرەدا بۆ زانین و بەئاگا بوونمان بەكورتی ئامارەیەك دەكەین بە ناوەڕۆكیان..

یازدە قوتابیەكەی حەزرەتی عیسا دەستیان كرد بە ئامۆژگاری و بانگەواز، ویستیان قوتابی دوازدەهەم لە جێگەی (یەهوزای ئەسخەریوتی) دابنێن و ببنەوە بەدوازدە، ئیدی رایان هاتە سەر كەسێك بە نێوی (میتاس).

قەشە پۆترۆس كەوتە لۆمەو سەرزەنشتی جولەكە، ئامارەی بەوە دەكرد كە جولەكەكان موعجیزەكانی عیسایان دەدی لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوان بوون كوشتیان، بەردەوام پۆترۆس و یۆحەنا ئامۆژگاری خەڵكیان دەكرد ئامادەی دانیشتنەكان و شوێنی مالومەكانی جولەكەیان دەكرد (كهنە الیهود) لێیان دەپرسین: بە چ ماڤ ئێوە ئەم كارە ئەنجام دەدەن؟ پۆترۆس وەلامی دەدانەوە: بەناوی مەسیحی ناسری ئەو مەسیحەی كە لەخاچتان دا، بەناو ئەو ڕۆژەی كەتێیدا مەسیحتان هەڵواسی...

سەرۆكەكانی مالومەكانی جولەكە لەنێو خۆیاندا كۆبونەوە بۆ ئەوەی ڕێگری پۆترۆس و یۆحەننا بكەن تا چیتر بەناوی عیسا قسەو بانگەواز نەكەن، بەلام نەیان توانی لە ترسی خەڵكی ئەم كارە بكەن .. بەو شێوەیە نێراوان بانگەوازیان ئاشكرا كرد وەخەڵكێكی زۆر كەوتنە شوێنیان بەمە دڵی سەرۆكی مالومەكان و سەدوقیەكان پڕ بوو، بۆیە هاتنە گرتنی قوتابیەكان، بەلام خواوەند فریشتەی بۆ ناردن وئازادی كردن، بۆیە ڕۆشتن بەرەو پەرستگا لەوێوە دەستیان كردەوە بە

بانگەواز و ئامۆژگاری خەڵکی جارێکی تر نێراوان دەستگیر کران وئەشکەنجە دران و تا ئیتر بەناوی مەسیحەوە قسە نەکەن..

لە بەشی حەوتەمدا قەشە ئەستافانۆس باسی پێغەمبەران ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب دەکات، وە چۆن برسیەتی بڵاو بۆوە لە میسر لە خاکی کەنعانەکان لە سەردەمی یوسف دا، پاشان باسی چیرۆکی موسا دەکات..

کاتێ ئەستافانۆس چیرۆکی موسای بۆ خەڵکەکە دەگێرایەوە کە چی بەسەر هات بەدەست قەومەکەیەوە، جولەکەکان ئەمەیان لێ بیست، بۆی چون و شار بەدەریان کردو بەرد بارانیان کرد، ئەویش هاواری دەکرد دەیوت خوای من مەسیح، گیانی من ڕاگرە، وەئەوەی زۆر ئەشکەنجە دەدرا لە بڕواداران شاول (قەشە پۆلس) بوو ..

قەشە فلیبس ئەویش دەستیکرد بە ئامۆژگاری خەڵکی، قەشە پۆترۆس و یۆحەنا ڕۆشتن بۆ ناوچەی (سامرە) تا بانگەواز لەوێ بکەن، فلیبس چوو بۆ (غەزە) هەروەها شاول بەردەوام بوو..

دەرنجامی ئەو ئەشکەنجەو ئازارەی کە توشی خەڵکەکە هات لەبەر ئەوەی شوێن قسەی نێراوان کەوتن پەرتەوازە بوون بە نێو شارو وڵاتاندا، زۆربەیان بەرەو فینقییای یۆنان و قوبرس و ئەنتاکیای ئیتاڵیا هەڵهاتن، بەهۆیانەوە زۆرێك لە خەڵکی ئەو ناوچانەش باوەڕیان بە ئایینی مەسیح هێنا ئەم هەواڵەش گەیشتەوە ئۆرشەلیم، بۆیە لەلایەن قوتابیەکانەوە (قەشە بەرنابا)یان نارد تا ئامۆژگاریان بکات، چون بەرنابا قەشە و لە خواترس بوو دڵی پڕ بوو لە باوەڕ هەروەك لە بەشی یازدە لە کرداری نێراوان برگەی (٢٤) دا هاتووە، بەم شێوەیە خەڵکێکی زۆر شوێن خۆیدا کەوتن..

بەرنابا بانگی شاولی کرد، کۆبونەوە لە کڵێسە[1]، بۆماوەی یەك ساڵ پێکەوە زانیاری و ئامۆژکاریان ئەنجام دەدا   هەر لەو کاتەدا هێرۆدس هێرشی کردە سەر کڵێسە و سوکایاتی پێکرد، یاقوبی برای یۆحەننای کوشت، پۆترۆسی دەسگیرکرد، بەندی بەندیخانەی کرد، تا جولەکەکان لێی ڕازیبن، بەڵام خواوەند فریشتەیەکی بۆ نارد و ڕزگاری کرد

کاتێ جولەکەکان بینیان خەڵکی کۆدەبنەوە و باوەڕ دێنن، دڵیان پڕ بوو لە قین ورق   پۆڵس و بەرنابا بە جولەکەکانیان دەوت: ئێوە لەپێش هەموو کەس ـ چون بانگەوازی مەسیح بە نەوەی جولەکە هاتبوو ـ بەناوی عیساوە بدوێن، بەڵام ئێوە پاڵتان نا بەوەوە و بەنگەوازەکەیتان قبوڵ نەکرد، وە بڕیارتان دا کە ئێوە شایەنی ژیانێکی هەتا هەتایی نین ، بۆ ئەمەشە ئێمە هاتوین و بانگەواز دەکەین ..

جولەکەکان هانی پیاو ماقوڵانی شاریان دا، تا پۆڵس و بەرنابا شار بەدەرکەن، دەرەنجام هەڵ هاتن و ڕوویان کردە شاری ئەیقونیا لەوێ ئامۆژگاریان دەست پێکردەوە

---

[1] وشەی (کنیسە ـ کڵێسە) وشەیەکی عەرەبی نیە، بەڵکو وەرگیراوە لە زمانی سریانی و یۆنانی، لەلای سریانیەکان بەمانای (مجمع ـ کۆڕ) دێت. بەڵام لەلای یۆنانیەکان  ولە پەیمانی نوێدا ولە پەرتوکی پیرۆزدا بەکارهاتووە بە (اکلیسا أو أکلیزیا) کە:

- بەمانای کۆبونەوەی هاوڵاتیانە لە وڵاتی یۆنان ، ئەوەی کە حکومەت کۆی دەکردنەوە بۆ دانانی یاسا و کاری تر.
- وە بەکار هاتووە بۆ ئەوشوێنەی کە خەڵکی تیا کۆدەبێتەوە بۆ بەندایەتی و خواپەرستی.
- وە بەکاردێ بۆ کۆمەڵی بڕواداران بەشێوەیەکی گشتی.
- وە لەبەکار هێنانێکی تردا بەمانای کۆبونەوەی بڕواداران دێت لە شوێنێکی دیاری کراو وەك کڵێسەی ئۆرشەلیم.
- وەهەروەها بەمانای کۆمەڵێکی کەمی بڕوادارانیش هاتووە، هەر وەك لە نامەی یەکەمی پۆلس داهاتووە کەناردوێتی بۆ خەڵکی کۆرنیسوس، کە لەدواترە ئاماژەی پێدەکەین.

بەرنابا و مەرقەس ـ بەرنابا خاڵی قەشە مەرقەسە ـ چون بۆ لای قەیسەر تا لەوێ ئامۆژگاری خەڵکی بکەن بە ناوی مەسیحەوە.. بەڵام پۆڵس شاری (سوریا و کیلکیلیا) ی هەڵبژارد بەو شێوەیە نێراوان کەوتنە ئامۆژگاری، پاشان پۆلس گەڕایەوە بۆ ئۆرشەلیم، لەوێ جولەکەکان لێی هەستان تۆمەتباریان کرد بەوەی کە دژی گەل و ئاینی جولەکە کاردەکات، بۆیە دەستگیریان کرد، بردیانە دەرەوەی کڵێسەوپەرستگاکە، وە ویستیان بیکوژن، لەو کاتەدا سەرۆکی نوسەرەکان[1] هات، پۆڵس داوای لێکرد کە بواری بدات تا وتارێك بۆ خەڵکی بدات، بەزمانی عیبری، وتارێکی بۆدان، باسی ئەوەی بۆ کردن کە چۆن وەختی خۆی ئەم ئازاری باوەڕداران و شوێن کەوتوانی مەسیحی دەدا، وە چۆن و بە چ شێوەیەك باوەڕی هێنا، بەڵام جولەکەکان سور بوون لە سەر لێدان.. بەڵام سەرۆکی جولەکەکان زانی کە پۆڵس خەڵکی رۆمایە وازی لێ هێنا..

حەنانیا کەسەرۆکی مالومانی جولەکەبوو، چوو بۆلای والی شار لەگەڵ خۆی چەند دیاریەکیشی بۆ برد تا شکات بکات لە دژی پۆلس .. ئەغریباس کە والی شار بوو، ناردی بە شوێن پۆڵسدا کە ئامادە بێت لەبەردەمیدا... پۆڵس داوای لە والی کرد تا ڕێی پێ بدا قسە بکات، ئەویش ڕێی پێدا، پۆلس کەوتە قسە وباسی چۆنیەتی باوەڕ هێنانی خۆی ـ هەروەك چۆن باسی هاتووە لە بەشی بیست وشەشەمی کرداری نێراوان برگەی ١٧ ـ کە تێیدا دەڵێت: بۆ ئەوەی خەڵکی چاویان بکەنەوە تا بگەڕێنەوە لە تاریکیەوە بەرەو ڕۆشنایی، لە دەسەڵاتی شەیتانەوە بۆ

---

[1] نوسەرانی شەریعەت: ئەو نوسەرانەن کە شارەزایان لە شەریعەتی ئایینی مەسیحی و جولەکەدا هەبوون، ئەمەش بەهۆی کارەکەیانەوە کە نوسەری بوو، وەپێشیان دەوترێ: (الحكماء ـ السادة ـ حوکمران و گەورەکان) وەبەیەکێ لەوانیش دەڵێن: (أب ـ باوك) وە بەهۆی ئەم کاریانەوە دەوڵەمەند بوون بەشێوەیەکی دیار وبەر چاو، بنوارە: الموسوعة الميسرة في الأديان: ص٣١٧، وەرگێڕ.

ژێر دەسەڵاتی خودا ، تا بەهۆی باوەڕەوە لە تاوانەکانیان خۆش ببن و بەشێك لە پیرۆزییان دەست کەوێت ...

- نامەی پۆلس بۆ خەڵکی ڕۆما:

لێردا باسی چۆنیەتی باوەڕی مەسیحیەکان دەکەین بەرامبەر بە حەزرەتی عیسا (سڵاوی خوای لێبێت):

لە بیرو باوەڕی مەسیحیەت دا هاتووە: کە عیسا کوڕی مرۆڤە لەڕوی لەش ولارو جەستەوە، وەکوڕی خوایە لە ڕوی گیانەوە، بۆیە باوەڕیان وایە کە عیسا خودایە، چون بەشێکە لە گیانی پیرۆز کە خودا هێناویەتی وخستویەتیە ناو جەستەی مەریەمەوە.. بەشێوەیکی تر پێیان وایە کە مەسیحی ڕزگار کەر بەشێکە لە خواوەندی پیرۆز، لە شێوەی مرۆڤدا خۆی نواندوە.. بڕگەی(١ ـ ٥) لە بەشی یەکەم باس و ڕاڤەی ئەمە دەکات..

پۆڵس خزمەتکاری عیسای مەسیح، نێراوی بانگخواز و تەرخان کراو بۆ ئاشکرا کردنی مزگێنی یەزدان، ئەو ئینجیلەی لە پێشەوە یەزدان پەیمانی داوە لە سەر زاری پێغەمبەرەکانی لە پەرتوکە پیرۆزەکاندا، ئەمەش تایبەتە بە ڕۆڵەکەی کە لە بارەی مرۆڤایەتیەوە لە نەوەی داوود پەیدا بووە، هەروەها لەبارەی ڕۆحی پیرۆزەوە سەلمێندراوە کە ئەو ڕۆڵەیەی یەزدانە بەهۆی هێزو توانای زیندوبونەوەی لە نێو مردوانا، ئەوەی بەهۆیەوە خەڵاتم وەرگرت تاوەکو ببم بە نێراو لە پێناوی ناویا، ئینجا هەموو گەلان بانگ بکەم بۆ باوەڕ هێنان و ملکەچی بۆ یەزدان..

نامەکەی پۆڵس بۆ خەڵکی ڕۆما پێك هاتووە لە شازدە بەش، لە بەشی دووەمدا ئامارژە بە بەڵگەکانی مەسیحیەت دەکات بەرامبەر بە جولەکەکان لە سەر قەدەغە کردنی خەتەنەکردن، وە لەبەشی چوارەمدا باس و وەڵامی جولەکەکان دەداتەوە کە

پێیان وایە کە جولەکە گەلی هەڵبژاردەی خودان وەئەوان تایبەتن لە نێو بەندەکانی تریدا، هەروەك لە برگەکانی ٢٨ ، ٢٩، دا هاتووە( ئایا خودا تەنها بۆ جولەکەیە؟ یا بۆ هەموو گەلانە، نا بۆ هەموو گەلانە..)پۆڵس لە بەشی حەوتەمدا ئاماژە بە هەڵەی تەڵاق دان دەکات لە برگەی (٢ ـ ٣) دەڵێت: (ژنێ کە شووی کردبێ شەریعەت ئەوەندە بەمێردەکەیەوە ئەبەستێتەوە هەتا زیندوە، بەڵام کاتێ مێردەکەی مرد ئەوسا شەریعەت لە پەیوەندی پێوەی رزگاری دەکات، جا لەبەر ئەمە بەدرێژایی ئەو کاتەی مێرد زیندووە، گەر ژن پیاوێکی تری هەبێ بە داوێن پیس ناو ئەبرێ، بەڵام ئەگەر مێرد بمرێ ئەوسا ژن سەربەست ئەبێ، بە شەریعەتی ژن ومێردایەتی گەر ببێ بە هی پیاوێکی کەش بەداوێن پیس دانادرێ) .

لە بەشی یازدەدا لە برگەی (٢ ـ٣) پۆڵس باسی تاوانەکانی جولەکە دەکات ودەڵێت: (یەزدان واز لەگەلەکەی خۆی ناهێنێ کە لە پێشدا هەڵیبژاردوون، ئایا نازانن پەرتوکی پیرۆز دەربارەی ئەلیاس پێغەمبەر ئەڵێ چی؟ کاتێ شکاتی لە ئیسرائیلیەکان کرد لەلای یەزدان و وتی: ئەی یەزدان ئیسرائیلیەکان نێراوەکانتی کوشت قوربانیەکانتی روخاند جا من بەتەنها ماومەتەوە..).

- **نامەی یەکەم لە پۆڵسی نێراوەوە بۆ خەڵکی کۆرنیوسوس[1]:**

ئەم نامەیەش شازدە بەشە، هەموویان ئامۆژگارین، باس لە برگەی (١، ٢، ٣) دەکەین لە بەشی یەکەم (لە پۆڵسی نێراوی عیسای مەسیح بە ویستی خوداو سوستنیسی برام بۆ کڵێسەی خودا لە کۆرنیوسوسی پیرۆز لەلایەن عیسای

---

[1] کورنیوسوس: پۆلس ئەم نامەیەی بۆ کڵێسەی کورنیوسوس نووسی کاتێ پۆلس بۆ ماوەی سێ ساڵ نشتەجێی بوو لە شاری ئەفسەس، لە گەشتی سێیەمی بەنگەوازەکەی، وە هەر دوو شاری ئەفسەس و کۆرنیوسوس بەرامبەری یەکن لە سەر دەریای ئیجە.

مەسیحەوە بانگکراوین لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە بە ناوی خودا عیسای مەسیحەوە دەدوێن لەهەرجێ بین ، ڕێزی بۆ ئێوە لە لای خودای باوکەوە وخوای عیسای مەسیحەوە...).

- نامەی دووەم لە پۆڵسی نێراوەوە بۆ خەڵکی کۆرنیوسوس:

ئەم نامەیەش لە یازدە بەش پێك هاتووە، هەروەها بریتیە لە ئامۆژگاری، لە بڕگەی (١ ـ٦) دەڵێت: (لە پۆلسی نێراوی عیسای مەسیح بە ویستی خوداو تیموساوسی برام بۆ کڵێسەی خودا لە کۆرنیوسوسی پیرۆز لەگەڵ هەموو کەشیشەکان ئەوانە لەگەل یەك بران، ڕێزی بۆ ئێوە لە لای خودای باوکەوە وەلەلای خودای عیسای مەسیحەوە.. پیرۆز بێ لە لایەن باوکی عیسا مەسیح و باوکی بەزەیی و خوای هەموو ماتەمێك، ئەو خودایەی ماتەمی دەگێڕێ لە هەموو ناخۆشیەکمان، بۆ ئەوە ئێمەش ماتەمی بگێڕین بۆ هەموو ئەوانەی کەسەغڵەت و نارەحەتی دێتە ڕێیان بەو شێوەیەی کەخوا ماتەمینی ئێمەدەکات، چونکە کاتێ ئازارەکانی مەسیح لەناوماندا زۆر دەبێ، هەرواش مەتەمینیمان زۆر دەبێ ...

- نامەی پۆڵسی نێراو بۆ خەڵکی غیلاتە[1].

پێك هاتووە لە شەش بەش لە سەر هەمان شێوەی نامەکانی تری پۆڵسە کە بریتین لە ئامۆژگاری و سەرزەنشتکردنی جولەکە .

- نامەی پۆڵسی نێراو بۆ خەڵکی فیلبی[2].

---

[1] غیلاتە: شارێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ڕۆژ ئاوای تورکیا.

[2] فیلبی: شارێکە دەکەوێتە باکوری یۆنان .

- نامەی پۆلسی نێراو بۆ خەڵکی کۆلۆسی[1]:

لە چوار بەش پێك هاتوە بریتین لەپەند و ئامۆژگاری...

- نامەی یەکەمی پۆلسی نێراو بۆ خەڵکی تسالۆنیکی[2]:

لە پێنج بەش پێك هاتووە..

- نامەی دووەمی پۆلسی نێراو بۆ خەڵکی تسالۆنیکی :

لە سێ بەش پێك هاتووە..

- نامەی یەکەمی پۆلسی نێراو بۆ تیمۆساوس[3]:

لە شەش بەش پێك هاتووە..

- نامەی دووەمی پۆلسی نێراو بۆ تیمۆساوس :

لە چوار بەش پێك هاتووە..

- نامەی پۆلسی نێراو بۆ تەیتس[4].

لە سێ بەش پێك هاتووە..

- نامەی پۆلسی نێراو بۆ فەلیمۆن[5].

---

[1] کۆلۆسی: شارێکە دەکەوێتە باکوری یۆنان.

[2] تاسالۆنیکی: شارێکە دەکەوێتە باکوری یۆنان.

[3] تیمۆساوس: یاریدەدەری پۆلس بوو، بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی وبەخششەکان لە شاری ئەفسس.

[4] تەیتس: یاریدەدەری پۆلس بوو لە دورگەی کریت.

[5] فەیلمون: ئەندامێکی دەوڵەمەندی کڵێسە بوو لە شاری کۆلۆکسی.

■ **نامەیەك بۆ عیبرانیەكان[1]:**

لە سیازدە بەش پێك هاتووە، لەم بڕگانەی کەباسی دەکەین چۆنیەتی ئامۆژگاریەكانی پۆلس باس دەكات بۆ جولەكە، ئەمیش بڕگەی (١ ـ ٤) لە بەشی یەكەم..

خودا گفتوگۆی دەكرد لەگەڵ مرۆڤدا لە ڕێی پێغەمبەرانەوە بەچەندین ڕێگای جیاواز، بەلام لەم ڕۆژانەی دواییدا قسەی لەگەڵ كردین لەڕێی كوڕەكەی كە كردیە میراتگری خۆی لە هەموو شتێكدا، كەدەبێتە پەیڕەوی كاری هەموو خەڵكی.. ئەو كوڕەی كە جوانی و بڵندی وێنەی كرۆكی خودای هەڵگری هەموو شتێ بوو، كاتێ خۆی ویستی ببێتە پاكەرەوەی تاوانەكان، ئێستاش دانیشتوە لەلای ڕاستی خودا لەئاسمانی بەرزو بڵند ..

وەلە بڕگەی( ١٤ ـ ١٧) بەشی سێیەمدا هاتووە:

ئێستا ئێمە بوینە هاوكاری مەسیح ئەگەر پەیوەست بین بەو متمانە جێگیرە تا كۆتایی.. لە دوای ڕقی چل ساڵ، ئایا ئەوانەی هەڵەیان كرد ئەوانە نەبوون لاشەیان لەبەرزاییەوە كەوتەخوارەوە.. ئەگەر وترا ئەمڕۆ بیستان دەنگی ئەو، با دڵتان قەسوەتاوی نەبێ وەك كەسێكی ناڕەزا..دەی كێن ئەوانەی كە بیستیان ناڕەزایی دەنوێنن؟ ئایا هەموو ئەوانە نەبوون كەبەهۆی موساوە هاتنە دەرێ لە میسر؟

وە لە بڕگەی (١ ـ ٣) لە بەشی یازدەدا هاتووە:

---

[1] عیبرانیەكان: بەو جولەكانە دەوترێ كە لەگەڵ حەزرەتی یەعقوب و كوڕەكانی پەڕینەوە لەڕووباری ئەردەن كاتێ كۆچیان كرد لە وڵاتی عێراق بۆ فەلەستین..

بەلآم باوەڕ بریتیە لە متمانە بەوەی داخوازی دەکەی، وە جێبەجێکردنی پوختانە لەو کارانەی کەنابیندرێ. وە ئەمەش لەئاکاری پێشیندا دەبینین. وە بەهۆی باوەڕەوە تێدەگەین کە دان بە پەیامی خودا دەنێن...

وەبەشی نۆیەم باس لە پێکهاتەکانی بەندایەتی جولەکەکان دەکات..

- **نامەی یاقوب:**

پێك هاتوە لە پێنج بەش.. لەبڕگەی (١ ـ ٦) بەشی یەکەم هاتووە..

یەعقوب بەندەی خودایە، واخوامان عیسای مەسیح ڕێشیشاندەری ئاشتیە بۆ دوازدە هۆزە کە پەرتەوازەبوون، براکانم دڵتان خۆش بێ کاتێ ئەکەونە تاقیکردنەوەی جۆراو جۆرەوە بزانن کە تاقی کردنەوەی باوەڕتان بۆ ئەوەیە کەبزاندرێ بەئارامن، بۆ ئەوەی بەئارامبی دەبێ کارێکی تەواو ئەنجام بدەی تا خۆشتان تەواو وکامڵ بین نەك کەم وکوڕ بن لە هیچ شتێکدا.. ئەکەر هەریەکێ ویستی داوای دانایەك بکات، با داوا لە خودا بکات ببەخشێ بەسەر هەمووان بەشێوەیەکی زۆر وفەڕ، پێی ناخۆشنیە، بەڵکە بە هەمووان دەبەخشێ..

- **نامەی یەکەمی بۆترۆسی نێراو:**

لە پێنج بەش پێك دێت، لە بڕگەی (١ ـ ٤) بەشی سێیەمدا هاتووە..

ئەی گرۆهی ژنان دەبێ ملکەچ و گوێڕایەڵی مێردەکانتان بن با بەشێکیشیان ملکەچی پەیامی خودا نەبن، بە ڕەفتاری ژنەکەیان دەی بەنەوە بەبێ وەرگرتنی پەیام، تێبینی ڕەفتاری پاکتان دەکرێ بەترسەوە، با جوانیتان جوانیەکی دەرەکی نەبێ لە پرچ هۆنینەوە، ویەخۆوە کردنی خشڵی ئاڵتوون و لەبەرکردنی پۆشاك بەڵکە مرۆڤ ئەو دڵە شاراوەیەیە کە بەدەربێ لە خراپە، جوانی ڕۆح ولەسەرخۆ و هێمنە کەلە پێش خواوەندەوە دێت کە نرخی زۆرە ..

- **نامەی دووەمی پۆترۆسی نێراو:**

**پێك هاتووە لە سێ بەش: لەبڕگەی (١ ـ ٥) بەشی یەکەمدا هاتوە:**

**سەمعان پۆترۆس بەندەی عیسای مەسیحە ونێراوە بۆ لای ئەوکەسانەی کە لەگەڵماندا باوەڕی بەنرخیان هێنا کە هاو باوەڕی ئێمەن، بەچاکە کردن لە خواکەمان و دڵسۆزی بۆ عیسای مەسیح. با زۆرتر بێ ڕێزی و ئاشتی بەناسینی خوداو عیسای خوامان ...**

- **نامەی یەکەمی یۆحەنای نێراو:**

**بریتیە لە پێنج بەش لەبڕگەی (٥ ـ ١٠) بەشی یەکەمدا هاتووە:**

**ئا ئەو هەواڵەی کەبیستمان لێی، ئەوا بەئێوەی دەگەیەنم کەخودا نور و ڕۆشناییە، وەبەهیچ شێوەیەك تاریکی تێدا نیە، ئەگەر وتمان ئێمە هاوبەشی ئەوین، ئەوە بەرەو تاریکی دەڕۆین، درۆ دەکەین، وەبەڕێی ڕاستا نەڕۆیشتووین، ئەگەر بە ڕێی ڕۆشناییدا ڕۆیشتین کە خۆی هەر نورە، ئەوە هاوبەشی یەکترین ، وە خوێنی عیسای مەسیحی کوڕ، پاکمان دەکاتەوە لە هەموو هەڵەیەك. گەر وتمان هیچ هەڵەیەکمان نیە، ئەوە خۆمانمان گومڕا کردووە و دورکەوتوینەتەوە لەڕێی ڕاست، بەڵام ئەگەر دانمان بەهەڵەکانماندا نا ئەوکات ئەمیندار و داد پەروەرین، بۆ ئەوەی لە تاوانەکانمان خۆش ببێ و پاك ببینەوە لە هەموو تاوانێك، ئەگەر وتمان ئێمە هەڵە ناکەین ئەوا ئەومان بەدرۆزن دانا وشەی ئەو ڕاست نیە لە نێوماندا..**

- **نامەی دووەمی یۆحەنای نێراو:**

**نامەیەکی کورتە بەس ئامۆژگاریە...**

- **نامەی سێیەمی یۆحەنای نێراو:**

**ئەویش وەك نامەی پێشووە کورتەو بەس ئامۆژگاریە ..**

- **نامەی یەهوزا :**

نامەیەکە لە خۆگری ئامۆژگاریە.. تیایدا دەڵێت: یەهوزا بەندەی عیسای مەسیحە برای یەعقوبە، بۆ بانکراوانی پیرۆز لە پێناو خودای باوك ئەوانەی پارێزراون لەلای عیسای مەسیح تا میهرەبانی و ئاشتی وخۆشەویستیتان بەو زۆر بێ..

- **خەونی خوایانەی خودا :**

لە بیست ودوو بەش پێك هاتووە..وەك پێشتر باسمان کرد لە پێشەکی پەرتوکی مزگێنیدا هاتووە پێناسەی دەکات ودەڵێت: بریتیە لە پێشبینی کە لە خەون وهێما پێك هاتووە وە هۆکارێکە بۆ ئامادەکردنی بڕواداران لەسەر ئەو کۆسپ وناڕەحەتیانەی کە دێتە ڕێیان تا هاتنەوەی دووەمی عیسای مەسیح وە هاتنی ڕۆژی دوایی و ئاسمان و دۆزەخ..

ئەو خەونەیە کە وەك لە بەشی یەکەم لەبڕگەی (١٢ ـ ٢٠) دا هاتووە:

لامکردەوە تا ببینم ئەو دەنگەی کەدەدوا لەگەڵم ، کاتێ لام کردەوە بینیم حەوت ڕۆشنایی ئاڵتونیم دی لە نێو ئەو حەوت ڕۆشناییەدا شێوەی مرۆڤێکم دی کە داپۆشراو بوو بە پۆشاکێ کە تا ئەژنۆکانی هاتبوو، تا سەر سنگیشی ئاڵتون بوو .. بەڵام سەر قژی سپی بوو وەك خوری سپی وەك بەفر، چاوەکانی وەك کڵپەی ئاگر بوو، پێیەکانی وەك نوحاس وابوو کە دەتوت لەنێو گڕدا گەرم کراون. دەنگی وەك دەنگی ئاوێکی زۆر بوو، لەدەستی ڕاستیدا حەوت هەسارەی پێ بوو، وەهەروەها شمشێرێکی دوو زمانەی لەدەم دەهاتە دەر، ڕوخساریشی وەك خۆر وابوو بەئەندازەی ئەو ڕۆشنایی دەدا، کاتێ بینیم کەوتم بەسەر قاچیدا لەزمان کەوتم، دەستی ڕاستی خستە سەرم وتی پێم: مەترسە من ئەوەم کە یەکەمم و

وەکۆتاییشم، وەزیندوم کاتێ مردبووم، ئەوەتا زیندوم تا کۆتای هەتا هەتایی ئامین ..وە کلیلی دۆزەخ و مردنم پێیە، ئەوە دەنوسم کەبینیم وەئەوەی ڕوو دەدا، وە هیچ ڕوو نادا لە دوای ئەمە.. نهێنی ئەو حەوت هەسارەیەش کە بینیت لەسەر دەستی ڕاستم بوو، وەهەروەها ئەو حەوت ڕۆشنابییە ئاڵتونیەش ئەمەیە: حەوت هەسارەکە حەوت فریشتەی حەوت کڵێسەن، حەوت ڕۆشنایەکەش حەوت کڵێسەن..

وەك وتمان خەونی خوایانەی یۆحەنا لە بیست ودوو بەش پێك دێ هەموو بەشێ لێکدانەوەی خەونێکی دورور درێژە لەدوای ئەم بیست ودوو بەشەی خەونی خوایەتی یۆحەنا ئینجیل کۆتایی دێت ..

خوێنەری بەڕێز: ئەمەی باسمان کرد ناوەڕۆکی ئینجیل بوو، بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێ شارەزای ئینجیل بن، ئەوە پێکهاتەکانی بوو چوار ئینجیلە کە لەناوەڕۆکدا تا ئەندازەیە لە یەك دەچن، ئێمە باس و ناوەڕۆکی ئینجیلی مەتامان هەڵبژارد کە نمونەی ئینجلەکانی تریشە، پاشان ئاماژەمان بە.بیست و سێ پەرتوك کرد کە نمونەی کرداری نێراوانن، کە وەك نامە لەدوای بانگەوازی عیسا نووسیویانە..

وە لە هەر بەشێ لە بەشەکانی مەتا چەند باسێکمان هێنا تا بزانین و شارەزا ببین لە چیرۆك وباسی حەزرەتی عیسا وەك چۆن لەگێڕاوەی گاورەکاندا هاتووە، وەهەروەك چۆن هاتووە لە ئینجیلە باوەڕ پێکراوەکانیانەوە ئاوها بەبێ دەسکاری نوسیومانەتەوە..

****************

# ناوەڕۆکی مزگێنی (بەرنابا)

دەروازەیەك:

خوێنەری ئازیز: لەڕاستیدا نازانم لەچ جێیەك ولە چ بەشێکی ئەم ئینجیلەوە دەست پێبکەین، چون هەموو بەش و بڕگە و دەستەواژەیەکی سەرسامت دەکا، پەڕەکانی ئەم ئینجیلە پڕن لە ئامۆژگاری، لە وتەی بەنرخ، که ناکرێ فەرامۆش بکرێ، و وەلا بخرێ، سەرسام دەمێنی کە چۆن پشتگوێ خراوە و هیچی دەربارە نازانین..

ئینجیلی بەرنابا ئەو ئینجیلەیە کە (تەورات) بە قورئان دەبەستێتەوە، تۆمارێکە کە بانگەوازی حەزرەتی عیسای بەڕاست و دروستی لەخۆ گرتووە، ئاماژە بەوە دەکات کە چی بەسەر شەریعەت و ئایینی حەزرەتی موسا دا هاتووە، وەهەروەها چۆن مژدەدەرە بەهاتنی کۆتا پەیامی پەروەردگار لەسەر زەوی، ئەو ئایین و شەریعەتە تەواو وگونجاو وهەمەلایەن و مام ناوەندەی کە موحەمەدی کوڕی عبدالله پێشەنگی دەکات، ئەو شەریعەتەی کە لە خۆگری فەرمان و بیرو باوەڕی خوایەتیە، چەسپاوە، نەگۆڕە، دورە لە هەموو گومان و دەست تێوەردانێك ..

هەر کات ئەم ئینجیلە دەخوێنیتەوە خۆشەویستیت بۆ موسا زیاتر دەبێ، خۆشەویستیت بۆ عیسای کوڕی مەریەم، بۆ موحەمەدی کوڕی عبدالله (سلاوی خوایان لێبێت) زیاتر و پتەوتر دەبێ ...

بەڵێ: هەرکاتێ ئەم ئینجیلە دەخوێنیەوە، دەبینیەوە پەیوەستی و پەیوەندی نێوان ئایین وپەیامە ئاسمانیەکان چەندە، چۆنە، هەموو ئەمانە دەتبەن بەرەو خۆشەویستی تەواو، بەرەو باوەڕی پتەو، بەکێ؟ بەخودای گەورەو دلۆڤان، بە

خودای بەزەیی و میهرەبان، بە خودای بەرزو بەدیهێنەر، بەخودای بەخشندەو خولقێنەر... .

کاتێ بەنێو ئایەت وبەشەکانی ئەم ئینجیلە مەلان دەکەی، دەگەیتە قولایی ڕاستیەکان، دەگەیتە ئەو نمونە بەرزەی کە خواوەند دەیەوێ لە مرۆڤەکان .

ئەو پەند و بەسەرهات و دانایانە دەخوێنیەوە هەندێ جار خۆشیت دەداتێ، هەندێ جار ڕاتدەچڵەکێنێ کە تۆ لەکوێی؟ چی دەکەی؟ بەرەو کوێ دەچی؟ نەفس و ئارەزوی سەرکەش بەرەو چ هەڵدێرێکی بردووی!!

دەبێ ئەو نهێنیە چ بێ، کەوا زانایانی تایبەتمەند ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان دەربارەی ئەم ئینجیلە کردووە وا سارسام بوون، لە لۆژیك و پاراوی، لە دانایی و بەرزی وشە وردی، لەهەڵبژاردن و واتای ڕوونی، لە جوانی شێوازی داڕشتنی .. هەر چەند درێژە بدەین بە وەسف و پیاهەڵدانی هێشتا کەمە، برادەرانیش دەڵێن: چون ئێوە موسوڵمانن لایەنگرن، لەبەر چاوی کاڵی وی نیە ئەم کارەتان، بەڵکە دەبێتە پشت وپەنای دینەکەتان ئێمەش لێدەگەڕێین با دکتۆر (خليل سعادە) بۆمان بدوێ، کە وەرگێڕی ئەم ئینجیلەیە، لە ئینگلیزیەوە بۆ زمانی عەرەبی، کەخۆی مەسیحیە و چ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە، ئەمنیش وەکی خۆی وشە بە وشە دەیهێنمە زمانی کوردی بابزانین ئەو چ دەڵێ؟ ((ئەو ڕاستیەی کە هیچ گومانێکی تێدا نیە، نوسەری ئینجیلی بەرنابا لە پلەیەکی گەورەی بیرمەندییە، لەوپەڕی بەرزی تێگەیشتندایە، بەڵگەکانی بەهێزن، توندوتۆڵن لە پێشکەشکردنا، لە ڕوانگەی ئایینەوە بابەتە فەلسەفیەکان بەڕونی دەریدەخا، لە جەستە، لە هەست، لە نەفس لەدوا پلەی بەرزی ئەو نوسەرانەوەدێ کە لەم بابەتەدا لێکۆڵینەوەیان کردووە)) ئەمە ڕاو بۆچونی دکتۆر (خەلیل سەعادە)ی وەرگێڕە، خۆ ئەگەر

موسوڵمان بابا، له قورئان شتێ شارەزا بابا، ئاخۆ ئەو وەختە چی دەگوت، لانی کەم وەکی ئێمەی دەوت..گەرچی دکتۆری بەڕێز له پێشەکی وەرگێڕانەکەیدا بەگومانە لە سەر ئەو کاتەی کە ئەم ئینجیلەی تێدا نوسراوەتەوە، پێی وایە له سەدەی (شازدەهەمدا) نوسراوەتەوە وەپەیوەندیەکی نییە بە قەشە بەرناباوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە قسەو قسەلۆکەکان کە کراون دەربارەی ئەم ئینجیلە لەلایەن مەسیحیەکانەوە ئەو تانەیان لێدەدا و هەڵی دەوەشێنێتەوە بۆ نمونە: دکتۆر ئەو قسەیە پوچەڵ دەکاتەوە کەدەڵێت: ئەم ئینجیلە لە وڵاتێکی عەرەبی لەلایان کەسێك کە شارەزای زمانی ئیتالییە نوسراوەتەوە.. ئەوانەی گومانیان لەم ئینجیلەدا هەیە جۆری ئەو پەڕەیەیە کەلەسەری نوسراوەتەوە دەیکەنە بەڵگە، بەڵام دکتۆر ئەمە بەڕاست نازانێ ودەڵێ ئەو جۆرە پەڕەیە هەمان جۆرە کە پەڕەو پەرتوکەکانی دیەکەی پێ نوسراوەتەوە کە لە کتێبخانەکەی (پاپا سەکتیس) لە ڕۆما هەڵگیراوە هەروەها گومانبەران ئەوە دەکەنە بەڵگە کە لە نێو ئەم ئینجیلەدا وشەی (اليوبيل) هاتووە، کە بەواتای سەد ساڵ دێ، ئەڵێن: ئەم زاراوەیە لەسەردەم وزمانی عیسادا نەبووە، کەس بەکاری نەهێناوە! بەڵام دکتۆر خەلیل دەڵێ: نەخێر ڕاست نیە، بەڵکە ئەو وشەیە لە فەرهەنگ و سەرچاوە زمانەوانیەکاندا هاتووە بە واتای (ئاهەنگ) دێت، چون ئاهەنگ سەد ساڵ جارێ دەگێرێ، ئەوە گێڕانەوەی ئەو وشەیە یە بۆ ئەو دەم و وەختە گونجاوە، لەمانا دروستەکەی کەبۆی داندراوە کە ئاهەنگە هاتووە و مانایەکی تازەی لێوە وەرگیراوە کە مانای (سەد ساڵ) دێت، بەم چەشنە دەزانین کە ئەم زاراوەیە هی ئەو سەردەمەیەو گومانی تێدا نییە..

دکتۆر خەلیل ڕاو بۆچونێکی تری هەیە لەسەر ئەم ئینجیلە ، دەڵێ: ((نوسەری ئەم ئینجیلە جولەکەبووە پاشان بۆتە گاور پاشان بۆتە موسوڵمان، بەڵگەش لەسەر ئەمە لەم ئینجیلەدا ئەوەیە کە نوسەر زۆر شارەزایی هەبووە لە (تەورات) وپەرتوکەکانی سەدەی کۆن، کە بەدەگمەن لەنێو گاوزاندا کەسێکی وەها شارەزا ببینیتەوە، مەگەر ئەوانەی کەتایبەتمەندن و هەموو ژیانیان تەرخان کردوە بۆ لێکدانەوەی کتێبی پیرۆز، لەوەش دەگمەنتر ئەوەیە زۆر زۆر کەمن ئەوانەی شارەزایی (تەورات)یان هەبوو بێ و شارەزاش بن لە ئینجیلی بەرنابادا))[1].

لێردا تێبینی ئەوەدەکەین کە مەسیحیەك شایەتی دەدا کە ئەم ئینجیلە نەنوسراوەتەوە لەلایەن موسوڵمانێك، دکتۆر ئاماژە بەوەش دەکات کە نوسەری ئەم ئینجیلە کەسێکی جولەکەبووە خەڵکی (ئەندەلوس)یش بووە، دوای ئەوەی بۆتە مەسیحی بۆتە موسوڵمان..

ئێمەش وتەیەکمان هەیە لەسەر بۆچونەکەی دکتۆر خەلیل، وەك لای هەمووان ئاشکرایا کە قەشە بەرنابا خواناس و شارەزایەکی جولەکە بووە پێش ئەوەی ببێتە گاور و باوەڕ بە حەزرەتی عیسا بهێنێت، پاشان ئێمە پێمان وایە کە بنەما و یاساو ڕێساکانی شەریعەتەکان لێکەوە نزیکن وەشەریعەتی مەسیحیەت جیاوازیەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ شەریعەتی جولەکەو بگرە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیش، بۆیە دەبینین ئەوەی لە ئینجیلی بەرنابادا هاتووە لە بەرنامەو بۆچونەکانی ئیسلام دەچێ، بەمەش ئەو گومانەی دکتۆر دەرەوێتەوە، وە لەسەری لادەچێ ئەو ڕامان وشڵەژانە..

---

[1] پێشەکی وەرگێری ئینجیلی بەرنابا: د. خەلیل سەعادە.

بەڕێز موحەمەد ڕەشید[1] - خاوەنی چاپەمەنی (المنار)ە، وەبڵاوکەرەوەی ئینجلی (بەرنابا)یە - لە پێشەکی چاپی عەربیەکەدا دەڵێت: ((ئەوەی تێبینی دەکرێ کە بەشێ لە قەشەکان ئەوەی دەیکەنە بەڵگەیەکی بەهێز بۆ چەسپاندی هەرچوار ئینجیلەکە ئەو شاکارو شێوازە ئەدەبیە بەرزەیە کە ئینجیل هەیەتی، هەر کەسێ ئەو زانیاریانەی کە لە ئینجیلی بەرنابادا هەیە بخوێنێتەوە ئەو وەخت بۆی دەرەکەوێ ئاست بەرزی چەندە لەدەرخستنی بیرو ڕا وفەرمانەکانی پەروەردگار.. ئەگەر چاو بنوقێنین لەو سوودە مێژوییەی وەهەروەها لەو سێ باسەی کە جیاوازیمان هەیە لەگەڵ مەسیحیەکاندا - یەکتاپەرستی، لەخاچ نەدانی عیسا، وپێغەمبەرایەتی موحەمەد - ئەوە بەسە پاڵێنەر بێ بۆ لەچاپدانی ئەم ئینجیلە کە لە خۆگری چەندەها پەندو ئامۆژگاری ڕەوشت وداب و نەریتی بەرز وجوانە، وە خودا بەویستی خۆی ڕێنیشاندەرە بۆ ڕێگای ڕاست..))[2].

خۆزگایە ئەو ئینجیلە قەدەغەکراوانەی ترمان دەدۆزیەوەتا لە ڕێی بەراود کردنیانەوە بە چوار ئینجیلە ڕێپێدراوەکاندا بۆمان ساغ بوایەتەوە ئەوەی لە نێو ئەم ئینجیلەدا هاتووە ئەوەی حاشا هەڵ نەگرە ئەوەیە کە لە هەر چوار ئینجیلەکەدا وەصفی بەشێوەیەك هاتووە کە بەدەگمەن وەصفی کەسی تر وەها کرابێ: کە پیاو چاك و دڵ پڕ لە باوەڕی ناساندووە، ئەو کەسە بوو کە ماڵ و

---

[1] موحەمەد ڕەشید علی ڕەزا، لە بنچینەدا خەڵکی بەغدایە لە نەوەی حسینی کوڕی عەلییە، یەکێکە لە بانگخوازە کانی چاکسازی موسوڵمانان، وەزاناو مێژونووس و موفەسیری سەدەی بیستەم بووە، قوتابی موحەمەد عەبدەیە، خاوەنی گۆڤاری (المنار) ودروستکەری قوتابخانەی (الدعوة والارشاد)ە، وەخاوەنی چەندها کتێبە لەوانە تەفسیری قورئان و لە ساڵی (١٩٣٥م) کۆچی دوای کردووە لە قاهیرە، بڕوانە: الأعلام للزركلي: ٦/ ١٢٦، وەرگێڕ.

[2] پێشەکی بڵاوکەرەوەی ئینجیلی بەرنابا : موحەمەد ڕەشید: ل٨.

کێڵگەکەی فرۆشت لە پێناوی بانگەوازی حەزرەتی مەسیح، لە سەرەتای بانگەوازەوە تا کۆتایی هاوڕێیەتی عیسای کردووە، هەموو ئەوەی لەزاری حەزرەتەوە دەرچووە ئەم فێر بووە و زانیویەتی، بە پێچەوانەی شاول(پۆڵس) کە ئەو کاتەی بەرنابا دەرس فێر دەبوو و بانگەوازی دەکرد ئەو بڕوادار و شوێنکەوتوەکانی مەسیحیەتی دەچەوساندەوە، وەکاتێ باوەڕیشی هێنا بانگەوازی حەزەرەتی عیسا لە سەر زەوی کۆتایی هاتبوو..

ئەوەی ئاشکرایە ئینجیلی بەرنابا لە دووسەدو بیست ودوو بەش پێك هاتووە، کە هەر چوار ئینجیلەکەی تر (مەتا، مەرقەس، لۆقا، یۆحەنا) هەمویان نیو ئەوەندەی ئینجیلی بەرنابا نابێت.

ئیدی لێرەوە دەچینە ناو بەسەرهات و ژیانی حەزرەتی عیسا بە پێی ئەوەی قەشە بەرنابا بۆمان دەگێڕێتەوە، وەك وتمان لە دووسەد و بیست و دوو بەش پێك هاتووە، وەناکرێ هەمووی بهێنین بەڵکە ئەوەی پێویستکا ئاماژەی پێ دەکەین، سەرەتا ئەوپێشەکیەی کە هێناویەتی وەك خۆی دەیخەینە ڕوو، وەهەر بڕگەیەکیش بهێنین لە هەربەشێك، ئەوە بەتەنیشتیەوە ژمارەی بڕگەکە دەنوسین، بۆ نمونە ئەگەر بڕگەیەکمان نووسی ژمارە(١) مان دانا لە تەنیشتی پاشان بڕگەیەکی ترمان هێنا لەدوایەوە ژمار (٦) مان لێنوسی، ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە لەو بەشە بڕگەی (١) و(٦) مان هەڵبژاردووە، وە بەوشێوەیە..

# مزگێنی ڕاستی عیسا کەپێی ئەوترێ مەسیح

(پێغەمبەرێکی تازە نێراو لەلایان خوداوە بۆ جیهان، بە پێی گێڕانەوەی بەرنابای نێراو)

١ـ بەرنابا نێراوی عیسای ناصریە کە پێی دەوترێ مەسیح داخوازە کە ئاشتی و خۆشی بۆ هەموو خەڵکی سەرزەوی بێت.٢ـ ئەی بەڕێزان: خوای گەورەو سەرسوڕهێنەر لەم ڕۆژانەی دواییدا بەسەری کردینەوە بەپێغەمبەرەکەی عیسای مەسیح، بەسۆزێکی زۆرەوە تا فێرببین، لەو بەڵگانەی کە شەیتان کردویەتیە هۆکارێ بۆ گومڕاکردنی زۆرێك لەخەڵکی بەناوی تەقواو خواپەرستی. ٣ـ مژدەدەرن بە فەرمانێ کەزۆر کوفر وبێ باوەڕیە. ٤ـ دەڵێن: مەسیح کوڕی خوایە. ٥ـ وازیان لە خەتەنەکردن هێناوە کە خوا هەمیشە فەرمانی پێکردوە. ٦ـ بەدروست و حەڵاڵی دەزانن هەموو گۆشتێکی پیس. ٧ـ ئەوەی لەو نێوەندەدا گومڕا بوو (پۆڵس)ە، کە ناتوانم باسی لێوەبکەم بەبێ خەم و پەژارە. ٨ـ ئەمەش بووە هۆی نوسینەوەی، ئەوەی ڕاست و دروستە، ئەوەی بینیومەو بیستومە، کاتێ لەخزمەتی (یەسوع) دا بووم، تا پاك ببنەوەو شەیتان فریوتان نەدا، کەلە نێوبچن و بکەونە لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت. ٩ـ لێرەشەوە بە ئاگابن لە هەموو کەسێ کە مژدەتان پێدەدا بەفەرمان و ڕێسای تازە کە پێچەوانەی ئەوەیە کە دەینوسمەوە تا پاك ببنەوە پاکبونەوەیەکی هەتا هەتایی. ١٠ـ دەی خوای گەورە لەگەڵتانا بێ چاودێریتان بکات لە شەیتان وەلە هەموو حازیکی شەڕ و بەد ..ئامین.

○ بەشی یەکەم: (٢٢ بڕگەیە):

(مژدەی جوبرەئیل بۆ مەریەمی پاك بە لەدایك بوونی مەسیح)

١ـ لەم ڕۆژانەی دواییدا خودای گەورە جوبرەئیلی فریشتەی نارد بۆلای کچی داوێن پاك کەپێیدەوترێ مەریەم کە لە وەچەی داوودە و لە نەوەی یەهوزا یە. ٢ـ کاتێ ئەو کچە(مەریەم) دەژیا بەوپەڕی پاکیەوە، بەبێ ئەنجامدانی تاوانێك، دوور لە هەموو سەرزەنشتێ، بەردەوام بوو لە نوێژ و ڕۆژو، ڕۆژێك بەتەنها بوو کاتێ جوبرەئیلی فریشتە چووە ئەو شوێنەی ئەو سلاوی لێکرد و پێی وت: دەبا خودات لەگەڵ بێ ئەی مەریەم)). ٣ـ ئەو کچە پاکە ترسا لە دەرکەوتنی فریشتەکە.٤ـ بەلام فریشتەکە لەترس ئارامی کردەوە و پێی وت: مەترسە ئەی مەریەم چونکە ڕۆزییەکت لەلای خوداوە بەدەست هێناوە، هەڵبژاردووی کەببیتە دایکی پێغەمبەرێ، کەدەینێرێ بۆ گەلی جولەکە تا بە ڕێی شەریعەتدا بڕۆن بە دڵسۆزی. ٥ـ مەریەم وەلامی دایەوە وتی: چۆن کوڕم دەبێ ومن هیچ پیاوێ ناناسم. ٦ـ فریشتەکە وەلامی دایەوە وتی: ئەی مەریەم خوایە کە توانیویەتی مرۆڤ دروست بکات بە بێ مرۆڤ ئەوە باشتر ئەتوانێ کە لە تۆدا مرۆڤێ دروست بکات بە بێ مرۆڤ، چون لەلای وی کاری ئەستەم ومەحاڵ نییە.

○ بەشی دووەم: (١٤) بڕگەیە:

(جوبرەئیلی فریشتە هەواڵی دا بە یوسف کە مەریەمی پاك سکی پڕ بووە)

بڕگەی (١) وبڕگەی ( ٧ ـ ١٠ ) وبڕگەی(١٤).

بەلام مەریەم کاتێ زانی ویستی خودا چیە، دەترسا کەخەڵکی لێی توڕە ببن، بەهۆی ئەوەی ئەو سکی پڕ بووە بەرد بارانی کەن چون پێیان وایە داوێن پیسی کردووە، بۆیە خودا پشت و پەنایەکی بۆ دروست کرد لە خزم وهۆزەکەی خۆی کە

شۆرەت پاك بوو پێی دەوترا یوسف. ٧ـ ئەی یوسف بزانە ئەوەی دروست بوو، ئەو دروست بووەیە کە بە ویستی خوا بووە، ئەو کچە پاکە کوڕێکی دەبێ. ٨ـ وپێیدەوترێ یەسوع (عیسا).

٩ـ لێی قەدەغە(حرام) دەکرێ مەی و هەموو سەرخۆشکەر و هەموو گۆشتێکی پیس.

١٠ـ لەبەرئەوەی پیرۆزی خودایە، لە ڕەحمی دایکی بووە، دەبێتە پێغەمبەرێکی خودا، دەینێرێ بۆ گەلی جولەکە، بۆ ئەوەی دڵی نەوەی یەهوزا بگۆڕێ. ١٤ـ کاتێ یوسف لە خەو هەستا سوپاسی خوای کرد، ئیدی مایەوە لە گەڵ مەریەم وەك خزمەت کارێ بەو پەڕی دڵسۆزیەوە.

- بەشی سێیەم: (١٥) بڕگەیە:

(لەدایك بوونی مەسیحی سەرسام، وەدەرکەوتنی فریشتەکان بۆداواکردنی شکۆی ومەزنی بۆ خودا)

١ـ ئەو کات هێرۆدس ببووە پادشا بەسەر جولەکەوە بە فەرمانی قەیسەر ئۆغۆستۆس، وە بیلاتس فەرمان ڕەوا بوو لەو سەردەمەی کە مالومەکان ڕابەرایەتی دەکران لەلایەن (حەننان) و(قیافیا)[1]. ٣ـ کاریان بە فەرمانی قەیسەر دەکرد بوونە نوسەری هەموو جیهان. ٤ـ ئیدی هەریەکەیان ڕۆشت بۆ نیشتیمان و وڵاتەکەی خۆی، هەموو خەڵکی خۆیانیان ناساند بەپێی هۆزەکانیان تا ئەوانیش بینوسنەوە. ٥ـ لەو کاتەدا یوسف لەگەڵ ژنەکەی کە سکپڕ بوو گەشتیان کرد لە (ناسریە) کە یەکێ بوو لە گوندەکانی شاری (جەلیل) بۆ شاری (بەیت لەحم) (لەبەرەوەی شاری خۆی بوو،

---

[1] (حەنان) ناوی سەرۆکی مالومەکان بووە(رئیس الکهنة) هەروەها (قیافا)ش یەکێك بووە لەمالومانی ژێر دەستی . وەرگێڕ.

هەموویان لە هۆزی داود بوون) بۆ ئەوەی کاری نوسەری بکا بۆ قەیسەر. ٦ـ کاتیٚ گەیشتە بەیت لەحم جیٚگەو وشویٚنیٚکی نەبینیەوە، چون شارەکە بچوك بوو، وە خەڵکیٚکی گەڕۆك و نامۆی تیٚدابوو.

٧ـ بۆیە لەدەری شارەکە، لای دایە لەوەڕگەی شوانەکان. ٨ـ لەو کاتەی کە یوسف لەویٚدا مایەوە،مەریەم لەوە نزیك بۆوە کە منداڵی ببیٚ.٩ـ ڕۆشناییەکی زۆر چواردەوری مەریەمی دابوو.١٠ـ منداڵەکەی بوو بە ببیٚ ئازار. ١١ـ هەڵی گرت وخستیە سەر هەردوو دەستی.

١٢ـ پاش ئەوەی دایپۆشی و قوماتی کرد داینا لە ئاخوڕیٚکدا[1]. ١٣ ـ لەو کاتەدا هیچ جیٚگاو ڕیٚگایەکی نەبوو لە ماڵە. ١٤ ـ لەو کاتەدا کۆمەڵیٚکی زۆر لە فریشتە دابەزین باناوازیٚ کە پاك و بیٚگەردیان بۆ خودا دەوت؛ مژدەی ئاشتی وئاسایشیان بۆ ئەوانەی لەخودا دەترسان دەوت. ١٥ ـ مەریەم و یوسف سوپاسی خوایان کرد، لە سەر لەدایك بوونی عیسا، وەهەردووکیان هەستان بە پەروەردەکردنی بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە.

- بەشی چوارەم: (١٨) بڕگەیە:

(فریشتەکان مژدەی لەدایك بوونی عیسایان دا بە شوانەکان، وەئەوانیش دڵخۆش بوون بە بینینی عیسا).

---

[1] لە دەقە عەرەبییەکەدا وشەی (المذوّد) بەکار هاتووە، کە بەواتای ئاخوڕی ئاژەڵ دیٚت، دەکریٚ واش بیٚ چون پیٚشتر باسی ئەوە دەکات لە نەبوونی جیٚگەدا یوسف ومەریەم لایاندایە لەوڕگەی شوانەکان، خۆ ئەگەر وشەی (بیٚشکە) لەبری دابنیٚین دەشیٚ جوانتربیٚ، بەڵام وام بەباش زانی کە تا بتوانم دەقاودەق وشە و ڕستەکان وەرگیٚڕم .وەرگیٚڕ.

○ بەشی پێنجەم: (٤) بڕگەیە:

(خەتەنە کردنی عیسا)

١ـ کاتێ هەشت ڕۆژی یەکەم تەواو بوو، بە پێی شەریعەتی پەروەردگار، هەروەك چۆن نوسراوەتەوە لە پەرتوکی موسا، منداڵەکەیان هەڵ گرت وبردیان بۆ پەرستگا[1] بۆ ئەوەی خەتەنەی کەن. ٢ـ منداڵەکەیان خەتەنە کرد ناویان نا (یەسوع ـ عیسا) هەروەك چۆن فریشتەکە ناوی هێنا پێش ئەوەی سکی پڕ ببێ بەو کۆرپەیە. ٣ـ مەریەم و یوسف دەیانزانی کەبەهۆی ئەم منداڵەوە خەڵکێکی زۆر ڕزگاریان دەبێ یا لە نێو دەچن. ٤ ـ بۆیە پەرستنی خوایان دەکرد، و منداڵەکەیان بە باشی دەپاراست و پەروەردەیان دەکرد لە سەر ترسی خوا.

○ بەشی شەشەم : (١١) بڕگەیە:

(ئەستێرەیەك لە ڕۆژ هەڵاتەوە دەبێتە ڕێنیشاندەری سێ ئاگرپەرست ودەبنە جولەکە، ـ هاتن بۆ ئۆرشەلیم ـ تا عیسا ببینن و کڕنوشی بۆ بەرن و دیاری و خەڵاتی بدەنێ )

○ بەشی حەوتەم : (١١) بڕگەیە:

(سەردانی ئاگر پەرستەکان بۆلای عیسا و گەڕانەوەیان بۆ نیشتیمانەکەی خۆیان، پاش ئەوەی عیسا لە خەودا ئاگاداری کردنەوە کە بگەڕێنەوە).

---

[1] لە دەقە عەرەبیەکەدا وشەی (الهیکل) هاتووە، ئەم وشەیە وەك جەوهەری دەڵێت: بەواتای: ماڵێکی پیرۆز، ماڵ و پەرستگای گاوران، وە ماڵی بتەکان دێت بەم پێیە دەکرێ لە کوردیدا وشەی پەرستگای بۆ دابنێین. وەرگێڕ .

- بەشی هەشتەم : (١١) بڕگەیە:

(ڕاکردنی ـ مەریەم و یوسف ـ لە گەڵ مەسیح بەرەو میسر، وەکوشتنی منداڵان لەلایەن هێرۆدسە وە)

- بەشی نۆیەم : (١٦) بڕگەیە:

(عیسا ووتوێژ ومشت ومڕ دەکات لەگەڵ زانایان، دوای گەڕانەوەی بۆ لای جولەکەکان، کاتێ تەمەنی بوو بە دوانزدەساڵ)

٨ـ کاتێ عیسا تەمەنی بوو بە دوازدە ساڵ، لەگەڵ مەریەم و یوسف دا گەڕانەوە بۆ ئۆرشەلیم تا لەوێ کڕنوش بەرێ بەپێی شەریعەتی پەروەردگار کە نوسراوەتەوە لە پەرتوکی موسادا.٩ ـ کاتێ نوێژەکانیان تەواو بوو ئەوێیان بەجێ هێشت دوای ئەوەی عیسایان لێ ون بوو، وە گومانیان برد کە گەڕابێتەوە نیشتمانەکەی خۆی لەگەڵ خزم وکەسوکارەکانی. ١٠ـ بۆیە مەریەم و یوسف گەڕانەوە بۆ ئۆرشەلیم جاڕیاندا بەنێو خزم وکەس و دراوسێکان تا عیسا ببیننەوە. ١١ـ لە ڕۆژی سێیەم دا منداڵەکەیان بینیەوە لە پەرستگاکە لە نێو زانایاندا مشت ومڕی بوو لە سەر جوبرەئیل[1]. ١٢ـ وهەمووان سەرسام بوون بە پرسیار و وەڵامەکانی عیسا

---

[1] لەدەقە عەرەبیەکەدا وشەی (ناموس)ی هێناوە، ئەم وشەیەش لە ڕووی زمانەوانیەوە بە کەسێ دەوترێ کەنهێنی پارێزی کەسێکی تر بێت، بەڵام لەلای خاوەن پەرتوکە ئاسمانیەکان بە (جوبرەئیل) دەڵێن (ناموس) لە فەرمودەی بوخاریشدا هاتووە کاتێ پێغەمبەر(درودی خوای لێبێت) لەگەڵ خاتوو خەدیجەی هاوسەری دەچن بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفل باسی خۆی بۆدەگێڕێتەوە وەرەقە لەوەڵامدا دەڵێت: ((لئن کان ما تقولین حقا انه لیأتیه الناموس الذي یأتي موسی علیه السلام)) واتە ئەگەر ڕاستی وابێ وەك ئەوەی باسی دەکەی ئەوە جوبرەئیلە کە هاتووە بۆلای موسی دێت بۆلای تۆش. ئیدی وشەی (ناموس) بە جوبرەئیل دەوترێ چونکە خوای گەورە جوبرەئیلی تایبەت کردوە بە (الوحی ـ سروش) لەگەڵ (الغیب ـ نادیار) بڕوانە: الصحاح للجوهري: ص١٠٧٠، النهایة في غریب الحدیث لابن الأثیر: ٢/٧٩٧، وەرگێڕ.

دەیانوت: چۆن ئەم زانستە دەزانێت هێشتا ئەوتازە لاوە و فێری خوێندەواری نەبووە.

- بەشی دە: (٨) برگەیە:

(عیسا چۆتە تەمەنی سی ساڵی لە چیای زەیتون ئینجیلی لەلایەن جوبرەئیلی فریشتەوە بۆ دێت)

٦ـ کاتێ ئەو خەونە بۆ عیسا ڕوون بۆوە، زانی کە بۆتە پێغەمبەرێکی نێراو بۆ نێو ماڵی جولەکە، وەئەمەی بۆ مەریەمی دایکی ڕونکردەوە، وەپێی وت: ئەمە ئەوەی لێ بەرپا دەبێت، کە دەکەوێتە ژێر چەوسانەوەیەکی زۆر لە پێناوی شکۆداری خودا، وە ئیتر ناتوانیت لەگەڵمابیت وخزمەتم بکەیت. ٧ـ کاتێ مەریەم ئەم وەڵامەی لێ بیست، وتی: ئەی کوڕی خۆم من هەواڵی ئەمانەم پێ گەیشت، پێش ئەوەی تۆ لەدایك ببی، دەی شکۆداری وبڵندی بۆ ناوی پیرۆزی خودا. ٨ـ ئیدی لەو ڕۆژەوە عیسا لەدایکی دورکەوتەوە تا کاری پێغەمبەرایەتی ئەنجام بدات.

- بەشی یانزدە: (١٤) برگەیە:

(عیسا چارەسەری کەسێك دەکات کە توشی بەڵەکی بووە، وعیسا دەچێ بۆ شاری ئۆرشەلیم).

- بەشی دوانزدە : (١٦) برگەیە:

(ئامۆژگاری یەکەم کە عیسا پێشکەشی گەلی کرد ئەو ئامۆژگاریەی کە پەیوەندی بە ناوی پەروەردگارەوە هەیە)

٦ـ بەرزو پیرۆز بێ ناوی خودای پاك، ئەو خودایەی کە بەهۆی بوون وبەزییەوە ویستی دروست ببێ دروستکراوەکانی، تا شکۆداری و بڵندی بۆ ئەو بکەن .

٧ـ بەرزو پیرۆز بێ ناوی خودای پاك، ئەو خودایەی كە ڕۆشنایی هەموو قەشەو پێغەمبەرانی دروست كردووە پێش هەموو شتێ، بۆ ئەوەی خەڵكی جیهان ڕزگاركەن، هەروەك چۆن ووتویەتی لە ڕێگای بەندەی خۆی داود، دەڵێت: پێش ڕۆشنایی بەیانی لە ڕوناكی قەشەكان تۆم دروست كردووە. ١٨ ـ لەوكاتەدا عیسا سەرزەنشتی گەلی كرد بە شێوەیەكی توندوتیژ چونكە پەیامی خودایان بیرچوویوەوە، بەس نەفسی خۆیان بە لەخۆبای بوون سپاردوە.

١٩ـ وە لۆمەی مالومەكانی كرد كە چۆن كەم تەرخەم بوون لە خزمەتكاری خودا ولە سەر دڵ ڕەقیان. ٢٥ـ عیسا دەستی بەرز كردەوە بۆلای خودای پەروەردگار نزاو دوعای كرد. ٢٦ـ ئیدی جەماوەر دەستیان كردە گریان و وتیان: دەی باوا بێ ئەی پەروەردگار دەی باوا بێ. ٢٨ ـ پاشان مالومەكان كەوتنە مقۆمقۆ لە ناو خۆیان و بە خراپە باسی عیسایان دەكرد.

○ بەشی سیانزدە : (٢٠) برگەیە:

(ترس و نوێژی عیسا، ودڵنەوایی سەرسوڕهێنەری جوبرەئیلی فریشە)

٢ـ دوای ئەوەی كە هەموو شەوی ڕابوراند بە نوێژ ، عیسا لە بەیانیدا نوێژی كرد ، وتی: ٣ـ ئەی پەروەردگار من دەزانم نوسەرانی جولەكە ڕق وقینیانە لە منە.

٤ـ مالومەكانیش سورن لە سەر كوشتنم، من بەندەی تۆم. ٦ ـ خودایە بمپارێزە لە داو وفێڵی ئەوان، چون هەرتۆی ڕزگار كەرم . ٧ ـ تۆ دەزانی ئەی پەروەردگار كەمن بەندەی تۆم، داوام هەر لە تۆیە، ئەی پەروەردگار بەوشەو ناوی تۆ دەدوێم.

٨ ـ هەر پەیام و وشەی تۆ ڕاستە، هەر ئەویشە بەردەوام تا هەتاهەتایی دەمێنێتەوە.

○ بەشی چواردە : (١٩) بڕگەیە:

(مەسیح دوازدە قوتابی هەڵدەبژێرێ لە دوای چل ڕۆژ بەڕۆژو بوون)

١ ـ عیسا لە چیاکەوە دابەزی، بەتەنها لە شەودا پەڕیەوە بۆ لای خوارووی (ئەردەن). چل ڕۆژ و چل شەو بەڕۆژو بوو، هیچی نەخوارد نە بەشەو نە بەڕۆژ بەردەوام لە خودا دەپاڕایەوە، کە ئەو گەلەی بۆی نێراوە ڕزگاری بکات. ٩ ـ کاتێ عیسا بینی جەماوەر گەڕاونەتەوە بۆ ئەوەی ڕێگەی شەریعەت بگرنە بەر جەماوەرێکی زۆرن، چووە سەر چیاکە هەموو شەو لەوێ مایەوە هەر نوێژی دەکرد. ١٠ـ کاتێ ڕۆژ بووەوە لە چیاکە دابەزی دوازدە قوتابی هەڵبژارد ناوی نان نێراوان، یەکێك لەوانە: یەهوزا بوو کە لە دوایدا لە خاچ درا. ١١ـ ناوەکانیان بریتی بوو لە: ١٢ ـ ئەندۆراس و براکەی پۆترۆسی ڕاوچی. ١٣ـ بەرنابا کە ئەم ئینجیلەی نوسیوەوە، لەگەل مەتای ئەل عەشار، ئەوی دانیشتبوو بۆ باج وەرگرتن. ١٤ یۆحەنا و یاقوب هەردوو کوڕی زەبدەن. ١٥ ـ تەداوس و یەهوزا. ١٦ـ بەرتۆلۆماوس و فیلیپس.

١٧ـ یاقوب و یەهوزای ئەل ئەسخریوتی خیانەتکار. ١٨ ئەمانە دەرخەری نهێنیەکانی خواوەند بوون بەردەوام.

○ بەشی پانزدە: (١٨) بڕگەیە:

(ئەو نیشانەیەی کە مەسیح ئەنجامی دا لە کاتی ئاهەنگی گواستنەوەدا کە ئاوی گۆڕی بە مەی)

١٦ ـ ئیدی قوتابیەکانی باوەڕیان هێنا. ١٧ـ زۆرێ پەشیمان بوونەوە، وتیان. ١٨سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بەزەیی دەرخست بۆ جولەکە، وەماڵی یەهوزای بەسەرکردەوە بەخۆشەویستی، بەرزو بڵند بێ ناوی پیرۆزی.

- بەشی شانزدە: (٣٤) برگەیە:

(ئەو یاسا سەرسوڕهێنەرەی کە قوتابیەکانی فێرکرد لەبارەی پشت هەڵکردن لە ژیانی خراپەکاری)

١٦ ـ ئێوە کۆچ دەکەن وەك گەشتیارێ. ١٧ـ ئایا ئەوەی گەشت بکات لەڕێگادا بەڵەخانەو کێڵگە چیتر دروست دەکات لەدارو چیلەکەی جیهان؟ ١٨ ـ نەخێر نا بەڵکە چی سوك و ئاسانە کە سودی پێدەگەیەنێ ئەوە هەڵ دەگرێ. ١٩ـ با ئەمە پەند بێ بۆ ئێوە.

٢١ـ با دڵ و دەرونتان قورس نەکەن بە ئارەزو و جیهانی زۆرەوە کە دەڵێن: کێ دامان دەپۆشێ؟ کێ نانمان دەداتێ؟ ٢٢ ـ بەڵکە تەماشای گوڵ و درەخت لەگەڵ بەڵندەکان بکەن ئەوانی خودا دایان دەپۆشێ نانیان دەداتێ، ئەو خودا بڵند و شکۆدارەی کە گەورەترە لە هەموو شکۆداریەکی سولێمان. ٢٣ـ ئەو خودایەی کە دروستی کردون بانگتان دەکات بۆ خزمەتی، ئەو بە توانایە کە تێرتان بکات.

٢٤ـ ئەو خودایەی کە گەزۆی لەئاسمانەوە باراند بە سەر گەلی جولەکەدا بۆ ماوەی چل ساڵ، وە بەرگ و پۆشاکیانی پاراستن....

٢٥ ـ ئەوانەی کە ژمارەیان شەش سەدو چل هەزار کەس بوون لە پیاوان جگە لە ژن و منداڵ. ٢٦ ـ بەڕاستی پێتان دەڵێم کە ئاسمان و زەوی لاواز و ڕسوان، بەڵام بە میهرەبانی خۆی ئەوانە سوك نابن کە خواپەرستی دەکەن. ٢٧ـ دەوڵەمەندانی جیهان لەگەڵ خۆش گوزەرانیاندا، برسین، لە نێودەچن .

○ بەشی حەڤدە: (٣٠) بڕگەیە:

(باوەڕ نەهێنانی قوتابیان و ئایینی ڕاست)[1]

١٩- فیلبس وەڵامی دایەوە وتی: ئەوە چی دەڵێت گەورەم بەڕاست نوسراوە لە ئەشعیادا کە خودا باوکمانە، باشە چۆن منداڵی نەبون؟ ٢٠- عیسا وەڵامی دایەوە: لە ناو پێغەمبەراندا نمونەی زۆر نوسراوە کە ناکرێ دەقاودەق وەری گرین بەڵکە دەبێ بەمەعناوە وەری گرین. ٢١- چون هەموو پێغەمبەران کە ژمارەیان سەد و چل وچوار هەزار کەسە، کە خودا ناردونی بۆ هەموو جیهان هەندێ جار قسەیان بەئاڵۆزی کردووە.

٢٢- بەڵام دێت لە ئایندەدا گەورەی هەموو پێغەمبەران وهەموو پاکخوازەکان، ڕوناکی باڵ ئەکێشێ بەسەر تاریکی و هەموو وتەیەکی ئاڵۆزی پێغەمبەران، ٢٣- چون ئەو پێغەمبەری خودایە.

○ بەشی هەژدە: (١٨) بڕگەیە:

(ڕونی دەکاتەوە ئەشکەنجەی جیهان لە ڕێی خزمەتی خودا، بەڵام خودا دەیانپارێزێ)

١ ـ لەدوای ئەوە عیسا ئەوەی وت، وتی: ئێوە نەبوون منتان هەڵبژاردووە، بەڵکە من ئێوەم هەڵبژاردووە کە ببنە قوتابیم، کاتێ خەڵکی جیهان ڕقیان لە ئێوە بووەوە، ئەوە بەڕاستی ئێوە قوتابی منن. ٢- چونکە جیهان بەردەوام دوژمنی ئەو

[1] بەراستی سەرباسی ئەم بەشە ئاشکراو واتادار نیە، لە دەقە عەرەبیەکەدا بەم شێوەیە هاتووە(عدم إیمان التلامیذ ودین (مامن) الصحیح) لە دوو نوسخەی جیاوازی تری ئینجیلی بەرنابا گەڕام، هەر بەم شێوەیە نوسرابوو، وەرگێڕ.

بەندانەن کە لەخزمەتی خودان. ٤ ـ بیرکەنەوە لەو پێغەمبەرە پاکانەی کە کوژران بەدەستی جیهان.

٥ ـ وەك ئەوەی ڕوویدا لە سەردەمی (ئیلیا) ، کە (ئیزابل) دەهەزار پێغەمبەری کوشت ، تەنانەت بەزەحمەت ڕزگاری بوو (ئیلیا) ی داماوو حەوت هەزار لە کوڕانی پێغەمبەران کە سەرۆکی سەربازەکان شاردبونیەوە. ٦ ـ ئای لە جیهانی خراپەکار کە خودا ناناسێ.

- بەشی نۆزدە: (٣٤) بڕگەیە:

(مەسیح ئاگاداری هاوڕێیانی دەکاتەوە بە بەدەستەوەدانی، وە دەکەسی بەڵەك چاك دەکاتەوە کاتێ لە چیاکە دابەزی)

- بەشی بیست: (١٢) بڕگەیە:

(ئەو بەڵگەیەی کەعیسا ئەنجامی دا لە ناو دەریادا، وبڵاوی کردەوە کە پێغەمبەر بۆ کوێ ئەچێ)

- بەشی بیست ویەك : (٣٠) بڕگەیە:

(عیسا شێتێك چارەسەر دەکات، وە بەراز فڕێ دەداتە دەریاوە، وەچارەسەر کردنی کچی کەنعان)

- بەشی بیست و دوو: (١٦) بڕگەیە:

(بەد بەختی بۆ ئەوانەی کە خەتەنە نەکرێن، کە سەگ باشترە لەوان)

١٥ ـ لەو کاتەدا قوتابیەکان وتیان: پێمان بڵێ ئەی مامۆستا، لەبەر چ هۆیەکە دەبێ مرۆڤ خۆی خەتەنەبکات؟ ١٦ ـ عیسا وەڵامی دایەوە: ئەوە بەسە بۆتان کە خودا فەرمانی کرد بە ئیبراهیم و پێ وت: ئەی ئیبراهیم پارچە چەرمەکەت ببڕە،

وەهەروەها چەرمی خەتەنەی هەموو ماڵەکەت، .چون ئەوە پەیمانێکی نێوان من تۆیە هەتا هەتایە.

○ بەشی بیست و سێ: (٣٦) برگەیە:

(بنچینەی خەتەنەکردن، پەیمانی خودا لەگەڵ ئیبراهیم، نەفرەت کردن لە چەرمی خەتەنە)

○ بەشی بیست و چوار: (٢٢) برگەیە:

(نمونەیەکی ئاشکرا چۆن مرۆڤ پێویستە ڕا بکات لە خۆشگوزەرانی)

١ ـ کاتێ عیسا ئەمەی وت، دەستی کردە گریان و وتی: وای بۆ ئەوانەی کە خزمەتی لاشەیان دەکەن. ٢ـ چون بەڕاستی ئەوانە خێرو خۆشی ژیانی کۆتاییان بەدەست ناهێنن، بەڵکە سزای هەڵەکانیان دەبێ وەر گرن.

○ بەشی بیست و پێنج : (٢٥) برگەیە:

(چۆن پێویستە لە سەر مرۆڤ کە لاشەی بەکەم بزانێت، وەچۆن بژی لە جیهاندا)

١ ـ لەوکاتەدا نوسەر وتی [1]: ئەی مامۆستا قسەو وتەی تۆ ڕاستن، بۆیە هەموو شتێکمان واز لێهێناو شوێن تۆ کەوتین. ٢ ـ دەی پێمان بڵێ چۆن لەسەرمانە کە لاشەمان بتۆرێنین؟ ٣ـ خۆ کوشتن دروست نیە، مادام دروستبوین بە زینویی پێویستە لەسەرمان کە پاکی بکەینەوە. ٤ـ عیسا وەڵامی دایەوە: لاشەت بپارێزە وەك ئەسپێ کە دەژی لەکاتێکی ئاساییدا. ٥ ـ چون ڕۆزی و ئالف دەدەی بە ئەسپ بەبێ کێشان، بەلام کاری پێ دەکەی بە بێ ئەندازە. ٦ ـ لغاو دەکەیتە دەم و قەپۆزی تا بڕوا بە وەی خۆت ئەتەوێ. ٧ ـ دەیبەستیەوە تا خەڵکی ئیزعاج نەکات. ٨ـ لە شوێنێکی سوك و پیسدا دەیبەستیەوە. ٩ـ کەلای دا لێی دەدەی. ١٠ ـ ئەی

---

[1] مەبەست لە نوسەری ئەم ئینجیلەیە.. وەرگێر.

بەرنابا ئاوها بكە ئەگەر تۆ دەتەوێ بژی لەگەل خودا. ١١ـ رقت لە قسەكەم نەبێتەوە، چون داود ئاوهای كردووە لە گەڵ نەفسی خۆیدا، هەر وەك خۆی چۆن دانی پێدا دەنێ و دەڵێ (من وەك ئەسپ وەهام لەلای تۆ، وەهەمیشە من لەگەڵتام).

○ بەشی بیست و شەش: (٦٩) برگەیە:

(چۆن پێویستە لە سەر مرۆڤ كە خوای خۆش بوێت، وە ئەم بەشە لەخۆگری باسی ململانەی نێوان دوو كەسی سەرسامە ئیبراهیم و باوكی)

٤ ـ لەو كاتەدا عیسا وتی: ئیدی ئێوە شێتن ئەكەر هەستتان نەبەخشن بەخودا ، بۆ ئەوەی نەفستان بكڕن و تا كانزای خۆشەویستیتان جێگیر ببێ. ٤ـ چون خۆشەویستی كانزایەكە وێنەی نیە. ٦ـ چون هەر كەسێ خودای خۆش بوێ، ئەوا خودا لە گەڵیەتی. ٧ ـ وە هەركەسێ خودا لەگەڵی بێ، ئەوە هەموو شتێ بۆ ئەو دەبێ.

(ئەم بەشە باس لە چۆنیەتی گاڵتە پێكردنی ئیبراهیم دەكات بە خوا دەسكردەكانی باوكی) .

○ بەشی بیست و حەوت: (٢٢) برگەیە:

(ئەم بەشە ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە پێكەنین جوان نیە بۆ خەڵكی، وە باسی زیرەكی ئیبراهیم دەكات).

- بەشی بیست و هەشت: (٢٢) برگەیە:

سەرباسی بەشی بیست و هەشت بریتیە لە[١] (شکاندنی بتەکان لەلایەن ئیبراهیم پێغەمبەر وە ڕزگار بوونی لەئاگرەکەی کە بۆیان کردبۆوە).

- بەشی بیست و پێنج : (٣٩) برگەیە:

(گەیاندنی پەیامی خودا لەلایەن جوبرەئیلی فریشتە بۆ ئیبراهیم)

- بەشی سی: (٢٧) برگەیە:

١ ـ عیسا ڕۆشت بۆ ئۆرشەلیم لە نزیك بونەوەی جەژنی (المظال)[٢] کە یەکێکە لە جەژنەکانی گەلەکەمان. ٢ـ کاتێ نوسەر و فەریسیەکان بەئەمەیان زانی ڕاوێژیان کرد، کە لە کاتی قسەکردنیدا دایبەزێنن. ٣ـ بۆیە زانایەکیان هات بۆلایو وتی: ئەی مامۆستا چی پێویستە بیکەم تا ژیانی هەتا هەتایی بەدەست بهێنم؟

- بەشی سی و یەك : (٢٤) برگەیە:

١ـ مالومەکان لە عیسا نزیك بوونەوە، وتیان: ئەی مامۆستا دروستە سەرانە بدەینە قەیسەر؟ ٢ـ عیسا لایکردەوە بەلای یەهوزا و وتی: ئایا پارەتان پێیە؟ ٣ـ پاشان عیسا فلسێکی گرت بەدەستەوە، لای کردە لای مالومەکان وپێی وتن: لە سەر ئەم فلسە وێنەیەکی تێدایە، پێم بڵێن وێنەی کێیە؟ ٤ـ وەڵامیان دایەوە: وێنەی

---

[١] تێبینی: لە بەشی یەکەم تا بەشی بیست و حەوتەم هەموو بەشەکانی ئینجیلی بەرنابا سەرباسی خۆی هەیە لەنێوان دوو کەوانەدا ئامازەمان پێکردوە، بەڵام لە دوای بەشی بیست و حەوتەوە بەبێ سەرباسە، بەلام لە پێناوی ئەوەی بابەتەکان کورتکەینەوە خۆمان سەرباسمان بۆ هەندێکیان داناوە.

[٢] المظال: کۆی وشەی (مظلة) یە بەواتای چەتر دێت؛ جەژنی (المظال) بە سێیەمین جەژنی جولەکەکان دێ لە دوای جەژنی (فصح ـ دەرکەوتن) و جەژنی (الأسابیع ـ هەفتەکان)، وە چەند ناوێکی تریش ناو دەبرێ، پێی دەڵێن: (عید السلام ـ جەژنی ئاشتی) و (عید البهجة ـ جەژنی خۆشی) هەموو ساڵێ لە ١٥ تشرینی یەکەم دا ئەم جەژنە بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ دەگێرێت، بنوارە: موسوعة الیهود والیهودیة:١٤ / ٢١٦. وەرگێڕ.

قەیسەرە. ٥ـ ئینجا عیسا پێی وتن: ئەوەی هی قەیسەرە بیدەنە قەیسەر، وە ئەوەی هی خودایە بیدەنە خودا. ئیدی مالومەکان بەبێ هیوا و سەرشۆڕی ئەوێیان بە جێ هێشت.

○ بەشی سی و دوو : (٤١) بڕگەیە:

(بەردەوام بونی مالومە جولەکەکان بۆئەوەی عیسا بخەنە داوەوە، بەوەی چەند پرسیارێکی شەرعیان لێدەکرد)

٣٩ ـ عیسا وەڵامی دایەوە بەڕاست پێتان ئەڵێم: مەڵێن شەریعەت ئەپەرستم، بەڵکە بڵێن: خۆشمان ئەوێت خودای پەروەردگار بە هەموو نەفسێ، بە هەموو دڵێ، بە هەموو ئەقڵێ. ٤٠ ـ پاشان عیسا وتی: ئەمە ڕاستە؟ ٤١ ـ هەموو وەڵامیان دایەوە وتیان: بەڵێ ڕاستە.

○ بەشی سی و سێ: (٢٣) بڕگەیە:

١ ـ پاشان عیسا وتی: ڕاستە هەموو ئەوشتەی کە مرۆڤ خۆشی دەوێ لە بەر خاتری ئەوە هەمووشتێ واز لێ ئەهێنێ، ئەوە ئەو شتەتی کردۆتە خودای خۆی. ٢ـ بەو چەشنە خودای داوێن پیس ئەو ئافرەتە داوێن پیسیە، وە خودای چڵێس و مەستان لاشەیەتی. ٣ـ وە خودای چاو چنۆك زیو و ئاڵتونە. ٤ ـ لەسەرئەمەوە هەموو هەڵە کارێ بپێوە.

○ بەشی سی و چوار : (٢٣) بڕگەیە:

١ـ لەبەردەم دەرگاکەدا کەسێکی لێ بوو، دەستی ڕاستی وشك ببۆوە بەئەندازەیەك نەیدەتوانی بەکاری بهێنێ. ٢ـ عیسا ڕوو ودڵی کردە خوداو دوعای کرد، وتی: بابزانن ئەو قسانەی دەی کەم ڕاستن، ئەڵێم: بەناوی خودا ئەی پیاو دەستی

نەخۆشت درێژ دەكەم، ڕای كێشاو درێژی كرد بە شێوەیەكی دروست، بەشێوەیەك كە قەت نەخۆش نەبووبێ.

○ بەشی سی و پێنج : (٢٧) برگەیە:

١ـ عیسا بەرەو ئۆرشەلیم كەوتە ڕێ. ٢ـ چوو بەرەو دەشتی سەرو ئەردەن. ٣ـ لەوێ قوتابیەكانی كە لە چوار دەوری دانیشتبوون وتیان: ئەی مامۆستا پێمان بڵێ شەیتان چۆن دەركرا بە هۆی لە خۆبایی بونیەوە؟

○ بەشی سی وشەش: (٤٠) برگەیە:

٢ـ لەو كاتەدا عیسا وتی: بەڕاستی پێتان دەڵێم: ئەوەی نوێژ نەكات لە شەیتان خراپترە. ٣ـ وە توشی ئازارو ئەشكەنجە دەبێتەوە. ٤ ـ چونكە شەیتان پێش ئەوەی بكەوێ، كەسێك نەكەوتبوو تا بترسێ لە كەوتن. ٥ـ وە خودا هیچ پێغەمبەرێكی بۆ نەنارد، تا تەوبە بكات و پەشیمان بێتەوە. ٦ـ بەڵام مرۆڤ خودا هەموو پێغەمبەرانی بۆ ناردن، جگە ئەو پێغەمبەرەی كەدێ لەدوای من ، چون خوا ویستی وایە هەتا ڕێگای بۆ خۆش بكات.

○ بەشی سی وحەوت : (٢٤) برگەیە:

(عیسا قوتابیەكانی فێری نوێژ دەكات)

٦ـ ئەی خودای پەروەردگار. ٧ـ بەرزو بڵند بێ ناوی پیرۆزی تۆ. ٨ـ دەسەڵاتی تۆ دێتە ناومان.٩ـ بۆئەوەی هەمیشە ویستی تۆ جێبەجێ بكات. ١٠ـ وەكو چۆن جێبەجێ كارە لە ئاسمان، دەی با جێ بەجێ كاریش بێ لە سەر زەوی، ١١ـ نانمان بدەرێ بۆ هەموو ڕۆژێ. ١٢ـ لە تاوانەكانمان خۆش ببە. ١٣ـ هەروەك چۆن ئێمە لەوانە خۆش ئەبین كە غەڵەتمان لەگەڵ دەكەن. ١٤ـ خوایە مەمان خەرە ژێر

تاقیکردنەوە. ١٥ـ بەڵام بشمان پارێزە لە خراپەکار. ١٦ ـ چون هەرتۆ خوداماني.
١٧ـ ئەو خودایەی کە دەبێ هەموو شکۆداری و ڕێزمان بۆ ئەو بێ هەتا هەتایە.

○ بەشی سی وهەشت: (٢١) بڕگەیە:

٢ـ عیسا وتی: ئایا گومان دەبەن کە من هاتووم لە پێناو شەریعەت و پێغەمبەران؟ ٣ـ بەراست پێتان دەڵێم: سوێند بەخودا من نەهاتووم بۆ ئەوەی پوچەڵیان بکەمەوە، بەڵکە بۆ ئەوەی بیانپارێزم. ٤ـ چون هەموو پێغەمبەرێ پارێزگاری شەریعەتی خودا دەکات، وە هەموو ئەوەی کە خودا وتویەتی لە سەر زمانی پێغەمبەرەکانی تر.

○ بەشی سی و نۆ: (٣٩) بڕگەیە:

(باسی دروست کردنی ئادەم، وەبینینی ئەو نوسراوەی ((لا إله إلا الله ومحمد رسول الله ـ هیچ خودایە نیە بە ڕاست بپەرسترێ جگە خودا، و موحەمەد نێراوی خودایە)).)

١٤ ـ کاتێ ئادەم لە سەر پێکانی وەستا، بینی لە هەوادا نوسراوێ، دەدرەوشایەوە وەك خۆر، دەقەکەی ئەمە بوو (لا إله إلا الله ومحمد رسول الله ـ هیچ خودایە نیە بە ڕاست بپەرسترێ جگە خودا، وە موحەمەد نێراوی خودایە) ١٥ـ ئەو کات ئادەم دەمی کردەوە وتی: سوپاس بۆ تۆ ئەی خودام کە تۆ چاکیت نواند کەمنت دروستکرد. ١٦ـ بەڵام دەپاڕێمەوە لێت کە پێم بڵێیت مانای ئەو وشانە چی یە: (موحەمەد نێراوی خودایە) ١٧ـ خودا وەڵامی دایەوە: بەخێر هاتی بەندەی من ئەی ئادەم. ١٨ـ ئەوە من پێتی دەڵێم: تۆ یەکەم مرۆڤی دروستم کردوی. ١٩ـ وەئەوەی بینیوتە ئەوە کوڕی تۆیە کە دێت دوای ئێستا بەچەندسالێك. ٢٠ ـ ئەو ئەو پێغەمبەرەیە کە لە بەرخاتری ئەو هەموو شتێکم دروست کردووە. ٢١ـ ئەو کاتێ

هات ڕۆشنایی دەبەخشێ بە هەموو جیهان. ٢٢ـ ئەو ئەو کەسەیە کە نەفسیم دروست کردووە لە ئاسمانی بەرز شەست هەزار ساڵ پێش ئەوەی هیچ شتێ دروست بکەم.

○ بەشی چل: (٢٠) بڕگەیە[1]:

(چۆنیەتی چونە بەهەشتی شەیتان بۆ ئەوەی ئادەم و حەوا فریو بدات)

○ بەشی چل و یەك: (٢٨) بڕگەیە:

(هەڵخەڵەتاندن و فریودانی ئادەم و حەوا لەلایەن شەیتانەوە، بە خواردنی ئەو میوەیەی کە خودا لێی قەدەغە کردن)

٢١ ـ لە وکاتەدا شەیتان بۆڕاندی چ بۆڕاندنێکی ترسناك. ٢٢ـ وە وتی: کە تۆ دەتەوێ من لەوەی کەهەم خراپ تر کەیت، ئەوا نەفسم ئەگۆڕم چەندە بتوانم. ٢٣ـ لەو کاتەدا خودا وتی: دورکەوە لە بەردەمم ئەی نەفرەت لێکراو. ١٤ـ شەیتان ئەوێی بە جێ هێشت.

٢٥ـ پاشان خوا بە ئادەم و حەوای ـ ئەو دوانەی کەدەژیان لەبەهەشتدا ـ وت: دەرچن لە بەهەشت. ٢٦ ـ کۆشش بکەن بە لاشەتان، با هیواتان لاواز نەبێ.

٢٧ـ چونکە من کوڕەکەتان دەنێرم لە شێوەیەك دا کە بتوانێ دەسەڵاتی شەیتان لە سەر ڕەگەزی مرۆڤ لابەرێت.٢٨ـ چونکە من هەموو شتێ ئەدەمەدەست ئەو پێغەمبەرە.

---

[1] ئەم بڕگەیە لە دەقە عەرەبیەکەی ئەم کتێبەی کە وەری دەگێڕین پەڕیوە، بەڵام بە باشم زانی ئاماژە بە سەرباسەکەی بدەین لە شوێنی خۆیدا هەروەك چۆن لە ئینجیلی بەرنابا، بەو چەشنەی لە تەرجەمە عەرەبیەکەی د. خەلیل سەعادە هاتووە.

○ بەشی چل ودوو: (٣١) برگەیە:

١ـ قوتابیەکان گریان دوای ئەو وتارە. ٢ـ عیسا دەستی کرد بە گریان دوای ئەوەی بینی زۆرێك لە وانەی کە هاتوون، بۆ ئەوە هاتوون بزانن کێیە و چی دەڵێت، و سیخوری بکەن بەسەریەوە. ٣ـ چون سەرۆکی مالومەکان لە ناو خۆیاندا بریاریان دابوو، کە بە قسەی خۆی خەن. ٤ـ بۆیە هەندێ لە لاویەکان و نوسەرەکانیان نارد بۆ لای تا لێی بپرسن تۆ کێیت؟ ٥ـ عیسا دانی نابەوەدا وتی: راستان ئەوێ من (مسیا)[1] کۆتا پێغەمبەرنیم.

٦ـ وتیان تۆ (ئیلیا) ی یا (ئەرمیا)ی یا یەکێ لە پێغەمبەرانی پێشینیت؟ ٧ـ عیسا وەڵامی دانەوە وتی: نەخێر. ٨ ـ لەو کاتەدا وتیان: دەی پێمان بڵێ تۆ کێیت؟

٩ـ دەی بڵێ تا شایەتی بدەینەوە بۆت لەلای ئەو کەسانەی کەناردویانین.

١٠ـ لەو کاتەدا عیسا وتی: من ئەو دەنگە دلێرەم لە ناو هەموو جولەکەدا.

١١ـ هاوار دەکات برۆن بە رێگای پێغەمبەری پەروەردگار هەر وەك چۆن نوسراوە لە ئەشعیادا.

○ بەشی چل وسێ : (٣١) برگەیە:

(پێغەمبەری خودا دێت لە وەچەی ئیسماعیل نەك لەوەچەی ئیسحاق)

٢٥ـ لەو کاتەدا عیسا وتی: هەر کاتێ پێغەمبەری خودا هات ئەوە لە وەچەی کێ دێت؟ ٢٦ ـ قوتابیەکان وەڵامیان دایەوە وتیان لە وەچەی داود دێت. ٣١ـ بەڕاستم بزانن ئەوەی ڕاست بێ ئەوە دەڵێم: پەیمان لەسەر ئیسماعیل نەك ئیسحاق.

---

[1] مسیا مەبەست لەم وشەیە لێرەدا ئەوەیە کە دەڵێت موحەمەد نیم.

○ بەشی چل وچوار: (٣٣) برگەیە:

لەو کاتەدا قوتابیەکان وتیان: ئەی مامۆستا لە کتێبی موسادا نوسراوە لە نەوەی ئیسحاق دێ. ٢ـ عیسا بە گەڵتەوە وەڵامی دانەوە، وتی: ئا ئەوە نوسراوەتەوە! ٣ـ بەڵام ئاخر نە موسا نە عیسا ئەمەی نەنوسیوەتەوە! بەڵکە ئەوە ئەو قەشانە نوسیویانەتەوە کە لە خوا ناترسن. ٥ ـ بەڕاستی پێتان دەڵێم: هەرکات زانیتان وتەی زمانی جوبرەئیلی فریشتە، ئەو دەمە دەزانن کە خراپە چەندە وچۆنە لە پەرتوك و زانایانی ئێمە. ٦ ـ چون فریشتە وتی: ئەی ئیبراهیم هەموو جیهان دەزانێ کە خودا چەندی تۆ خۆش ئەوێ. ٧ ـ بەڵام هەموو جیهان چۆن بزانن کە تۆ خۆشەویستیت چەندە بۆ خودا؟ ٨ ـ بەڵێ پێویستە دەبێ کارێ ئەنجام بدەی لە پێناوی خۆشەویستی خودا. ٩ـ ئیبراهیم وەڵامی دایەوە: ئا ئەمە بەندەی خودایە ئامادەم چی لێ بێت لە پێناوی خودا. ١٠ ـ ئینجا خوا قسەی لەگەڵ ئیبراهیم کرد، وتی: کوڕە نۆبەرەکەت بگرە کە ئیسماعیلە ببیە بۆ سەر چیایەك لەوێ سەری برە و پێشکەشی خودای بکە. ١١ـ دەی چۆن ئیسحاق نۆبەرەیە کە کاتێ لەدایك بوو، ئیسماعیل تەمەنی حەوت ساڵ بوو؟ ١٢ـ ئیدی قوتابیەکان وتیان: فێڵی زانایانمان ئاشکرایە، ئیدی تۆ پێمان بڵێ کەڕاستیت. چون دەزانین تۆ نێراوی خودای.

○ بەشی چل وپێنج : (٣١) برگەیە:

٢ـ عیسا ئەوێی بەجێ هێشت و ڕووی کردە ئۆرشەلیم. ٣ـ لە ڕۆژی شەمەدا چووە پەرستگاکە، ئیدی دەستی بەفێرکردنی گەل کرد. ٤ـ هەموو خەڵك لەگەڵ سەرۆکی مالومەکان بەپەلە چوون بۆ پەرستگاکە لە عیسا نزیك بوونەوە، و وتیان: ئەی مامۆستا پێیان گەیاندوین کە تۆ خراپ باسی ئێمە دەکەیت، ئاگات لەخۆبێ کەبەهۆیەوە توشی خراپە دەبی. ٥ ـ عیسا وەڵامی دانەوە: بەراستی پێتان دەڵێم

من بەخراپە باسی دوو ڕووەکانم کردووە، خۆ ئەگەر ئێوە دوو ڕوون، ئەوە باسی ئێوەم کردووە.

- بەشی چل وشەش : (٣١) بڕگەیە:

(عیسا سەرزەنشتی نەوەی ئیسرائیل و گەلی یەهوزا و ئۆرشەلیم دەکات، وپێیان ڕا دەگەیەنێ کە خوا لێیان تووڕەیە)

- بەشی چل وحەوت: (١٩) بڕگەیە:

١ـ لە ساڵی دووەمی کاری پێغەمبەرایەتیەکەی عیسا ئۆرشەلیمی بەجێ هێشت. ٢ـچوو بەرەو (نایین). ٣ـ کاتێ نزیك بووەوە لە دەرگای شار هەموو خەڵکی شار ئەڕۆشتن بەرەو گۆڕستان کوڕە تاقانەی بێوەژنێکیان هەڵگرتبوو.١٥ـ لەوکاتەدا عیسا هەناسەیەکی هەڵ کێشا وتی: دەی با ویست و توانات بجوڵێ ئەی خودای بەتواناو بە بەزەیی.١٧ـ پاشان دەستی مردوەکەی هەڵگرت و وتی: پێت دەڵێم ئەی گەنج بەناوی خودا هەستەرەوە بەساغ و سەلامەتی. ١٨ـ گەنجەکە زیندوبوەوە و هەناسەی دا.

- بەشی چل وهەشت: (١٨) بڕگەیە:

(لە نێو شاری نایینذا)

٩ـ دوبەرەکی کەوتە نێوان خەڵکی (نالین)ەوە لەسەر ئەوەی لە عیسا بینیان، بەشێ لە خەڵکی وتیان: ئەوەی سەردانی کردوین ئەوە بە دڵنیایەوە خودایە. ٢ـ بە شێکی تر وتیان نا خودا نابیندرێ، هیچ کەس نەیدیوە، تەنانەت موسای بەندەشی، دەی ئەوە خوا نیە بەڵکە کوڕی خودایە. ١١ـ بەشێکی تریش وتیان نا ئەوە خودا نیە، وە کوڕی خوداش نییە، چون خودا لاشەی نیە، بەڵکە ئەمە پێغەمبەرێکی

گەورەی خودایە. ١٢ ـ شەیتان ووتەوتی خستە ناو گەلەوە و خەریك بوو لە ساڵی سێیەمی پێغەمبەرایەتیدا تێکدانێکی گەورە بەرپا بکات .

○ بەشی چل وتۆ : (٢٥) بڕگەیە:

(عیسا وتاری دا بۆ ئەوەی ئیسرائیل و سەرزەنشتی کردن لە سەر ئەوەی کە ئەوان پێغەمبەرانیان دەکوشت)

○ بەشی پەنجا : (٤٥) بڕگەیە:

٥ ـ ئەیمرۆڤ بەڕاستم بزانە، کاتێ تۆ لۆمەی کەسێکی دیکە دەکەیت لە سەر تاوانێك ئەوە بزانە لە نێو دڵی تۆدا تاوان هەیە کە جێگەی لۆمەیە. ١٤ ـ بەڕاستی پێتان دەڵێم سوێند بەو خوایەی کە هەمووان لە بەردەمیدا ڕادەوەستین، ئەوا فەرمانی نا دروستە، ئەوە باوکی هەموو تاوانەکانە، چون کەس نیە هەڵە نەکات بەویستی خۆی. ٣٩ـ کاتێ عیسا لە قسەکانی بوەوە زۆرێك لە خەڵکی تەوبەیان کرد و پەشیمان بونەوە لە هەڵەکانیان، وە بەئاواتەوە بوون کە هەموو شتێکی خۆیان واز لێ بهێنن و شوێن ئەو بکەون.

○ بەشی پەنجا و یەك : (٤٠) بڕگەیە:

(وتوێژی نێوان عیسا و شەیتان)

○ بەشی پەنجا و دوو: (٢٠) بڕگەیە:

١ـ بەراستی پێتان دەڵێم: ئەو ڕۆژەی لێپرسینەوەی خودا دەست پێدەکات، زۆر سامناکە، بە شێوەیەك ئەوانەی کە سەرشۆڕو چەپ خراون، پێیان خۆشبە بچنە جەهەننەمەوە تا نەبیسن وشەو قسەی خوا کە بەتورەییەکی زۆرەوە قسەیان لەگەڵ دەکەن.

- بەشی پەنجا و سیٚ: (٣٧) برگەیە:

(عیسا باسی هەستانی رۆژی زیندووبوونەوە دەکات)

١ـ عیسا وتی: پێش ئەوەی ئەو رۆژە بێت جیهان تێکدانێکی گەورە بەخۆیەوە دەبینیٚ. ٢ـ وەجەنگێکی هەڵوەشێنەری قورس بەرپا دەبێت. ٣ـ وای لێدیٚ باوك کوڕی خۆی دەکوژیٚ . ٤ـ هەروەها کوڕ باوکی خۆی ئەکوژیٚ، بە هۆی پارچە بونی گەلەکانەوە.

- بەشی پەنجا وچوار : (٢٤) برگەیە:

(عیسا باسی رۆژی قیامەت و بەسەرهاتەکانی دەکات کە چۆن هەموو پێغەمبەران و فریشتەکان و هەڵبژێراوان پەنا دەبەنە بەر پێغەمبەری خودا)

- بەشی پەنجا و پێنج : (٣٨) برگەیە:

(باسی دانپیانانی پێغەمبەر دەکات بە تکاو شەفاعەتی پێغەمبەری خودا )

- بەشی پەنجا و شەش : (٨) برگەیە:

(لە رۆژی زیندووبوونەوە چۆن موحەمەدی پێغەمبەر دادەنیشیٚ لەلای ڕاستی خوداوەو، بە تەنیشتیشەوە پێغەمبەران و قەشەو پیاو چاکان وە کەسە پیرۆزەکان دادەنیشن)

- بەشی پەنجا وحەوت : (٢٩) برگەیە:

(باسی لێپرسینەوەی خودا دەکات لەگەڵ بەشەر و مەردومدا)

- بەشی پەنجا وهەشت : (٢٢) برگەیە:

(باسی دادپەروەری خودا دەکات لە کاتی لێپرسینەوەی دروستکراوەکانی).

○ بەشی پەنجا و نۆ : (٦١) برگەیە:

(عیسا باسی سزای هەڵەکاران دەکات، وەدادپەروەری خودا چۆنە لەوێدا، پاشان وەڵامی پرسیاری قوتابیەکانی دەداتەوە)

○ بەشی شەست : (٢٠) برگەیە:

٣ـ ئەی ئەوکەسەی بە دادپەروەری خودا شوێنێکی نەفرەت کراوت هەیە، ئەوجێی کە لەپێناو بێ باوەڕان و پشتگوێخراوان داندراوە. ٤ـ ئەوانە ئەیوبی خۆشەویستی خوا دەربارەیان دەڵێت: لەو جێیە هیچ یاسایەکی ڕێکخراو نیە بەڵکە ترسێکی هەتاهەتایە.

٥ـ پێغەمبەر ئەشعیاش دەربارەی پشتگوێخراوان دەڵێت: کڵپەی ئاگرەکەیان قەت ناکوژێتەوە، وە کرمی گیانیان قەت نامرێ. ٦ـ باوکمان داود دەگریا دەیوت: لەو کاتەدا بارانێکی بەخوڕ وهەورەبروسکەو هەورەگرمەو کبریت وگەردەلول بەسەریاندا دەبارێ.

٧ـ خاك بەسەریان هەڵەکاری کلۆڵ، ئای چەندە ڕقیان دەبێتەوە لە گۆشتی خۆش و پۆشاکی بەنرخ و ڕاخەری نەرم و ئاوازی گۆرانی هێواش ونەرم.

○ بەشی شەست و یەك : (١٩) برگەیە:

(عیسا باسی پاداشتی چاکەکاران دەکات بە خۆشی و بەهەشت)

○ بەشی شەست و دوو : (٢١) برگەیە:

(عیسا باسی دووڕوەکان دەکات لە بەندایەتیدا)

١٠ـ بەراستی پێتان دەڵێم: زۆرێکتان هەن خۆیان دەشۆن دەچن بۆ نوێژ.

١١ـ وەزۆرێك بەرۆژو دەبێ و دەبەخشێ. ١٢ـ زۆرێك دەخوێنێتەوە و مژدە دەدات بەخەڵكانی تر، بەڵام دەرنجامیان چارەیان گرانە لەلای خودا. ١٣ـ چون ئەوان لاشەیان پاك دەكەنەوە نەك دڵیان.

○ بەشی شەست و سێ : (٢٤) برگەیە:

١ـ دوای چەند رۆژێك عیسا بەلای شاری سامریەكان تێپەری، نەیان هێشت بچێتە ناو شارەكەوە، وە نانیان بە قوتابیەكانی نەدەفرۆشت. ٢ـ یاقوب ویۆحەنا وتیان: ئەی مامۆستا ئایا ناتەوێ بپارێیتەوە لە خودا كە ئاگرێك لە ئاسمانەوە بنێرێت بە سەر ئەو خەڵكانەدا؟ ٣ـ عیسا وەڵامی دانەوە: ئێوە نازانن چ رۆحێ پاڵینا بەئێوەوە كە ئاوا قسە بكەن. ٤ـ بیركەنەوە خودا سور بوو لەسەر ئەوەی شاری نەینەوا لە نێو بەرێ، چون نەیدەبینیەوە كەسێ لەوشارەدا بترسێ لەو شارەدا تا كار گەیشتە ئەوەی پێغەمبەر یۆنانی نارد بۆ ئەوشارە. ٥ـ بەڵام هەوڵی دا راكا بۆ تەرسوس لەترسی گەلەكەی. ٦ـ بەڵام خودا هەڵیدایە ئاوەكەوە. ٧ـ لە ئاوەكەدا ماسیەكە قوتی دا پاشان فرییدایە نزیك شاری نەینەوا. ٨ ـ كاتێ دەستی بە مژدەدان كرد خەڵكی ئەوێ هەموو تەوبەیان كردو پەشیمان بونەوە[1].

---

[1] لێرەدا وا پێویست دەكات كە لادەین لە هێنانی ناوەرۆكی ئینجیلی بەرنابا، وە ئاماژەیەك بكەین بە چیرۆكی پێغەمبەر یونس(سڵاوی خوای لەسەر بێ) كە چۆن لە تەورات وقورئان هاتووە، دوای ئەوەی زانیمان كەچون باس كراوە لە ئینجیلی بەرنابا، (بۆزانیاریتان باسی یونس لە ئینجیلی مەتا لە بەشی ١٢ لە ٣٨ دا هاتووە) ئەمە زانیاریەكە كەپێمان خۆش بوو خوێنەری ئازیز بزانێ دەربارەی رووداوێكی مێژویی یەكێ لە پێغەمبەران، وە چۆن لە هەرسێ ئایینە ئاسمانیەكان جولەكەو گاور و ئیسلام نوسراوەتەوە. ئەمەش چیرۆكەكەیە كە لە تەورات لەو سیفرەی كە پێی دەڵێن: یۆنان لە بەشی (١ ـ ٣) سیفری یۆنان بەشی: ١: ١ ـ پەروەردگار فەرمانی بە (یۆنانی كوری ئەمتای) كرد:

٢ ـ دەی برۆ بۆ شاری گەورەی نەینەوا، فەرمانی من بگەینە خەڵكەكەی، چون تاوانیان بەرزبۆتەوە بۆلام.

-

٢ ـ بەلام یۆنان خۆی ئامادەكرد كە ڕا بكات لە پەروەردگاری بەرەو شاری تەرەشیش، نزیك بۆوە لە شاری یافا لەویٚ بەلەمێكی دیەوە كەبیبات بۆ ئەو شارە.

٤ـ پەروەردگار بایەكی توندی هەلكرد لە سەر دەریاكە، دوای بوو بە گەردەلولێكی دەریایی هەتا وای لێهات بووە هۆی تێكشكانی بەلەمەكە.

٧ـ ئیدی وای لیٚ هات هەر یەكەو بە هاوڕێكەی خۆی دەوت با تیروپشك بكەین بزانین بە هۆی كێوە ئەم حالەمان بەسەر هات، ئیدی تیر وپشكیان كرد ناوی یۆنان دەرچوو.

١٥ ـ پاشان یۆنانیان گرت و فڕێیاندایە ناو دەریاكەوە، ئیتر هێمنی دای بەسەریانەوە، شەپۆلەكان هێواش بوونەوە.

١٧ ـ بەلام پەروەردگار نەهەنگێكی گەورەی بۆ ئامادەكرد، ئەوە بوو یۆنانی قوت دا.

بەشی ٢ : ١ ـ یۆنان دەستی بە دوعاو نزا كرد بۆ خودای پەروەردگار لە ناو سكی نەهەنگەكەدا.

٢ ـ دەیوت: پەروەردگارا من پەنا بەتۆ دەبەم لەو ناڕەحەتیەی كەتێیدام، دەی بە هانامەوە بیٚ، لە ناو سك و قولاییدا یادی تۆدەكەم تۆش بیسەری دەنگی منی.

١٠ ـ پەروەردگار فەرمانی بە نەهەنگەكە كرد كە یۆنان دەركاتە دەرەوەی دەمی لە كەناری دەریاكەدا فڕێی بدا.

بەشی سێیەم : ٣: ١ـ پەروەردگار بۆ دووەم جار فەرمانی كرد بە یۆنان..

٢ ـ هەستە برۆ بەرەو شاری گەورەی نەینەوا بلاوی بكەرەوە ئەو پەیامەی كە من پێتی دەگەیەنم.

٥ ـ ئیدی گەلی نەینەوا باوەڕیان بە پەروەردگار هێنا.

١٠ ـ كاتیٚ بینی كردارو پەشیمان بونەوەیان لە و ڕێگا خراپەی كە گرتبویان، وازی لەو سزایە هێنا كە بریار بوو بەسەریان بهێنیٚ ، وەبڕیاریدا لێیان خۆش بیٚ.

با تەماشای قورئان بكەین بزانین چۆن باسی پێغەمبەر یونسی كردووە، لە سورەتی ئەلئەنبیا ئایەتی: ٨٧، ٨٨.﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾ واتە: با باسی ماخۆی ماسیش بێنەوە بیر ـ مەبەست لە یونس پێغەمبەرە ـ بە تورەییەوە ڕۆشت پێی وا بوو ئێمە دەسەلاتمان پێی ناشكیٚ ناتوانین.بیخەینە تەنگانەوە، لە نێو تاریكایی دا هاواری كرد و وتی : خودایە جگە تۆ هیچ خوای دایكەم نییە، پاكی و بیٚ گەردی بۆ تۆیە من لە ڕیزی ستەمكاران بووم. ئێمەش بە هانایەوە چوین و ڕزگارمان كرد لەو ناڕەحەتیانەی بەسەری هاتبوون، بەو چەشنەش بڕواداران ڕزگار دەكەین))

- بەشی شەست و چوار : (٢٨) برگەیە:

(عیسا ئامۆژکاری وپەند ونمونە دەهێنێتەوە بۆ شوێن کەوتوانی، وە بەڵگە دەهێنێتەوە بەکار و هەڵوێستی پێغەمبەرانی پێش خۆی).

- بەشی شەست و پێنج : (١٩) برگەیە:

(عیسا و قوتابیەکانی لەجەژنی فەصح دەچن بۆ ئۆرشەلیم، وەبۆ شوێنێکی پیرۆز کەپێی دەڵێن(بیت جسر) لەوێش چارەسەری کەسێکی شەلی کرد و چاك بۆوە)

- بەشی شەست وشەش: (١٧) برگەیە:

---

وله سورەتی ئەلصافات هاتووە: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾﴾ واتە: (بەراستی یونسیش یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی خودا، لەپاش بەجێ هێشتنی گەلەکەی، چووە ناو کەشتیەکەوە کە پڕ لەخەڵك بوو، کاتێ خەڵکی کەشتیەکە بڕیاریان دا تیرو پشك بکەن بۆ ئەوەی یەکێ بخەنە ناو دەریاکەوە بۆ ئەوەی کەشتیەکەیان سوك ببێ، ئەو لە پشك خستن بەشدار بوو، لە پشکەکەدا بەرکەوت ودۆڕاندی، خستیانە ناو دەریاکەوە، بەفەرمانی خودا نەهەنگێ قوتی دا، یونس کەزانی کارێکی خراپی کردووە پەشیمان بۆوە سەرزەنشتی خۆی دەکرد، سا ئەگەر یونس یەکێ نەبایا لە ویردخوێنان، ئەوا دەمایەوە لە سکی نەهەنگەکەدا تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە، پاشان فرێمان دایە دەرەوە لە کەناری دەریاکە وەنەخۆشیش کەوتبوو، لەو جێگە چۆڵەدا درەختی (یەقتین) مان ڕواند تا سێبەری بۆ بکات ولەژێریدا بحەوێتەوە، پاش ئەوەی حەسایەوە فەرمانمان پێکردەوە کە بچێتەوە ناو گەلەکەی کە ژمارەیان سەد هەزار کەس یا زیاتر بوو، دەستی کردە ئامۆژگاریان ئیدی هەمویان باوەڕیان هێنا، ئێمەش تا کاتی مردنیان ژیانێکی خۆشمان بۆ ڕەخساندن)).

تێبینی: ئەم باسە دانەر لە ناوەڕۆکی کتێبەکەدا باسی هێنابوو، بەڵام پێم باش بوو کە لە پەراوێزدا باس بکرێ، بۆ ئەوەی کە بەشەکانی ئینجیلی بەرنابا نەبچڕێندرێ، هەروەها مانای ئایەتاکانیش، دانەر نەی هێناوە بەس تەنها دەقی ئایەتەکانی هێناوە.. وەرگێڕ.

(مەسیح وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە لە سەر پاداشتی چاکەکاران، وە پاداشتیان چی دەبێ لە بەهەشتدا)

○ بەشی شەست وحەوت: (٩) برگەیە:

(عیسا باسی قوربانی دەکات، وە بەکێ دەبێ ببەخشرێ)

٢ ـ بەڵام ئێوە پێیان مەگەیەننەوە کە بنچینە لە قوربانیدا بەخشینەوەی ژیانە کە بەکوڕی باوکمان ئیبراهیم بوو، ٣ـ تا کەس باوەڕ و ملکەچی باوکمان ئیبراهیمی بیرنەچێتەوە، لەگەڵ ئەو پەیمانە بەهێزەی کە لەگەڵ خوادا بەستی، وە ئەو بەرەکەتەی کە پێی بەخشی.

○ بەشی شەست و هەشت: (٢٧) برگەیە:

(باس لە سەرزەنشتی نەوەی ئیسرائیل و مالومەکان دەکات)

○ بەشی شەست و نۆ: (٢٥) برگەیە:

١ ـ سوێند بەو خودایەی کە ئەوەستم لە بەردەمیدا ئێوە خۆ هەڵواسن و مەراییتان لەمن نابینن جگە حەق و ڕاستی نەبێ. ٢ـ بۆیە پێتان دەڵێم پەشیمان ببنەوە ویگەڕێنەوە بۆلای خودا هەروەك باوانمان گەڕاونەتەوە کاتێ هەڵەیەکیان کردبێ، بادڵتان ژەنگ وژار نەکا. ٣ـ مالومەکان خەریبوو دیقیان دەکرد لەم وتارە، بەڵام نەیان دەتوانی قسەیەك بدرکێنن لە ترسی گەل.

○ بەشی حەفتا : (١٧) برگەیە:

(باس لەوە دەکات کە چۆن مەسیح سەرزەنشتی پۆترۆسی کرد کە وتبوی مەسیح کوڕی خودایە)

٤ـ عیسا وەڵامی دانەوە وتی ئێوە دەربارەی من چی دەڵێن؟ ٥ ـ بوتروس وەڵامی دایەوە و وتی: تۆ مەسیحی کوڕی خودای. ٦ـ لەو کاتەدا عیسا توڕە بوو، بگرە

تورەیی لێ دەباری، وە پێی وت: برۆ دورکەوە، چون تۆ شەیتانی، تۆ ئەتەوێ لکەدار وناشرینم کەی. ٧ـ پاشان هەڕەشەی لە یازدە قوتابیەکەی تری کرد وتی: وای بۆ ئێوە گەر ئەوە بەڕاست بزانن، چونکە من دەزانم هەرکەسێ وابڵێ ئەوا نەفرینی خودای بەنسیب دەبێ.

- بەشی حەفتا ویەك : (١٦) بڕگەیە:

(باسی ئەوە دەکات کە عیسا سەرزەنشتی هەموو ئەوانەدەکات کە دەڵێن: مەسیح لە تاوانەکانمان خۆش دەبێت).

- بەشی حەفتا و دوو: (١٧) بڕگەیە:

(مەسیح قوتابیەکانی ئاگادار دەکاتەوە کە چ خیانەتکارێ دەیەوێ بیدابەدەستەوە)

- بەشی حەفتا و سێ: (٣٩) بڕگەیە:

(مەسیح باسی مرۆڤ و شەیتان دەکات)

- بەشی حەفتا و چەوار: (٢٠) بڕگەیە:

(کەوتنە هەڵەی مرۆڤەکانەوە بەهۆی بیرکردنەوەی هەڵە)

- بەشی حەفتا و پێنج: (٢٤) بڕگەیە:

(باسی ئەوە دەکات کە مەسیح باسی چەند نمونەیەك دەکات لە سەر ئەو هەڵسوکەوتانەی کە مرۆڤ وا لێدەکات کە هەڵە و تاوان بکات، کە بەهۆیەوە دەرئەنجامێکی خراپی لێدەکەوێتەوە، وە بەر نەفرینی خودا دەکەوێت).

- بەشی حەفتا و شەش: (٢١) بڕگەیە:

(عیسا چەند پرسیارێکی دەوروژاند کە مەبەست لێی وەرگرتنی پەندە).

- بەشی حەفتا وحەوت: (١٨) بڕگەیە:

٣- عیسا وتی: سوێند بەخوا ئەو کەسەی حەق بناسیێ، بەڵام کار بە پێچەوانەوە بکات ئەوە سزایەکی زۆر بەئازاری تووش ئەبیێ بەشێوەیەك کە شەیتانەکانیش بەزیبان پێدا دێتەوە. ٤- ئایا پێم ناڵێن خودا بۆ زانیاری یا بۆ کردار و شەریعەتی بۆ هێناوین. ٥ - بەڕاستی پێتان دەڵێم: ئامانج لە هەموو زانستیێ بریتیە لەو دانایيەی کە کار بکەی بەوەی دەیزانی.

- بەشی حەفتا وهەشت: (١٩) بڕگەیە:

(ئامۆژگاری و دانایی فەلسەفە لەلایەن مەسیحەوە لە وەڵام دانەوەی پرسیاری هەندیێ لە قوتابیەکانی)

٤- عیسا وەڵامی دایەوە: هەرکاتیێ جیهان بەبیێ خۆر باش بوو، وە مرۆڤ بەبیێ دوو چاو باش بوو، وەهەر کاتیێ نەفس بەبیێ زانست باش بوو، ئەوا نەزانین کارێکی باش دەبیێ. ٦ - ئایا نازانن خودا فەرمانی بە فێربونی زانست کردوە.

- بەشی حەفتا ونۆ: (١٦) بڕگەیە:

(لێرەدا مەسیح لێکدانەوە دەکات بۆ ئاست و پلەی مرۆڤی چاك لەلای خوداو خەڵکی)

- بەشی هەشتا: (١٥) بڕگەیە:

(عیسا باسی چەند نمونەیەکی مێژوی گەلەکانی پێشو دەکات، وە هەڵوێستی پێغەمبەران لەبارەیانەوە)

- بەشی هەشتا و یەك: (٢٠) بڕگەیە:

(عیسا چەند پرسیاریێ پێشکەش دەکات ، لەگەڵ چەند هەڵوێستێك کە لە نێویدا پەند و ئامۆژگاریە)

- بەشی هەشتا و دوو: (١٩) بڕگەیە:

(هەواڵی پێغەمبەری چاوەڕوانکراو ـ مسیا)

- بەشی هەشتا و سێ: (٣١) بڕگەیە:

(پەند وئامۆژگاری وباسی پێغەمبەری چاوەڕوانکراو ـ مسیا).

- بەشی هەشتا و چوار: (٣٠) بڕگەیە:

(ئامۆژگاری جۆراو جۆر لەلایەن مەسیحەوە)

- بەشی هەشتا و پێنج: (٢٤) بڕگەیە:

(پەند و ئامۆژگاری)

١ـ عیسا وتی: ئەگەر مرۆڤێ کارێکی خراپی ئەنجام دا یا قسەیەکی خراپی وت، وەیەکێ چوو بۆی ڕاست بکاتەوە وە نەهێڵێ کاری وا ئەنجام بدات، ئەبێ ئەو چی بکات؟ ٢ـ قوتابیەکان وەڵامیان دایەوە: ئەوە کارێکی چاکی کردوە، چون خزمەتی خودا دەکات، ئەو خودایەی کەبەردەوام داوای نەکردنی کاری خراپی لێکردووین، هەر وەك چۆن خۆر هەمیشە تاریکی دەردەکات.

(ئاوا گفتو گۆ لە نێوان عیساو قوتابیەکانی بەردەوام بوو، لەنێویشیدا چەند پەند وئامۆژگاری تیا باس دەکرا)

- بەشی هەشتاو شەش: (٢١) بڕگەیە:

(ئاکارەکانی هاوڕێ)

١ـ با هاوڕێکەت هاوڕێ بێت، چاکە خواز بێت، هەر وەك ئەو چۆن ئەیەوێ تۆ چاك بکات.

- بەشی هەشتا و حەوت: (٢١) بڕگەیە:

( هاوڕێی ڕاستگۆ و هاوڕێی خراپ)

- بەشی هەشتا و هەشت: (٢٤) بڕگەیە:

١ ـ بەڵام دەبێ بەئاگا بیت کە لێپرسینەوەی نەفسی خۆت چاکترە

- بەشی هەشتا و نۆ: (٢١) بڕگەیە:

(ئارام گرتن لە سەر هاوڕێ، وە ئامۆژگاری کردنی)

- بەشی نەوەت: (١٨) بڕگەیە:

(عیسا وەڵامی پرسیاری قوتابیەکانی ئەداتەوە)

- بەشی نەوەت و یەك: (١٢) بڕگەیە:

١ ـ لەو کاتەدا ئاژاوەیەکی گەورە لە ناو جولەکەدا ڕوی دا هەمووی لەسەر عیسا بوو.

- بەشی نەوەت و دوو: (٢٠) بڕگەیە:

١ـ ئالەو کاتەدا ئێمە لەگەڵ عیسا ڕۆشتین بۆ کێوی سینا، لە سەر فەرمانی فریشتەی پاك.

٢ ـ عیسا لەوێ چل ڕۆژ مایەوە لەگەڵ قوتابیەکانی.

- بەشی نەوەت وسێ: (٢٣) بڕگەیە:

١ـ لەو کاتەدا عیسا دەستی بەرز کردەوە وەك هێمایەك بۆ بێ دەنگ بوون. ٢ـ ئینجا وتی: ئەی جولەکەکان بەڕاستی گومڕا بوو گومڕا بونێکی زۆر گەورە، چون بانگ لەمن دەکەن وەك خودا، کەمن مرۆڤێکم. نەفرین لەو شەیتانەی کەفریویدان، هەزار جار نەفرین.

٥ـ کاتێ عیسا ئەمەی وت، بەلەپی هەردوو دەستی کێشای بە دەموچاوی. ٦ـبەهۆی ئەوەوە هاوار بەرز بووەوە، وەبەشێوەیەك کە کەس گوێی لە قسەکانی عیسا نەبوو. ٧ـجارێکی تر دەستی بەرز کردەوە کە بێدەنگ بن. کاتێ هاوارو

هۆرەکە هێواش بوەوە. ٩ـ شایەتی دەدەم لەبەردەم ئاسماندا، وە هەموو شتێ لەسەرزەوی بە شایەت دەگرم، کە من دوورم لە هەموو ئەوەی کە وتوتانە.

١٠ـ چون من مرۆڤم و لەدایك بووی ژنێکم کە مرۆڤە و لە ناو دەچێت، وە دەکەوێتە ژێر فەرمانی خوداوە، توشی ناڕەحەتی دێت، لە خواردن، لە خەو، لە سەرما لە گەرما، وەك هەموو مرۆڤێك. ١١ ـ بۆیە چ کاتێ فەرمانی خودا هاتەپێش ئەوە قسەکانم وەك شمشێرێ وایە لەسەر هەموو ئەوەی کە پێی وایە من گەورەترم لەمرۆڤ. ١٢ـ کاتێ عیسا ئەم قسانەی دەکرد کۆمەڵە سوارێ تێپەڕی، دوایی زانی کە فەرمانڕەوا و هێرۆدس و سەرۆکی مالومەکان بەڕێوەن. ١٨ ـ مالومێك وەڵامی دایەوە: جولەکەکان دودڵن لە بەڵگەو قسەو بەرنامەکەت بەشێوەیەك کە هەنێکیان بە ئاشکرا دەڵێن تۆ خودای، بۆیە لەناچاری، بەهۆی گەلەوە بێین بۆ ئێرە لەگەڵ والی ڕۆمانی و هێرۆدسی پاشا. ١٩ـ بۆیە لە ناخی دڵەوە تکات لێدەکەین کە ئەم ئاشوبە با نەمێنێ کە بە هۆی تۆوە دروست بووە. ٢٠ـ چون هەندێ دەڵێن: تۆ خودای، هەندێکی تر دەڵێن: کوڕی خودای، وەهەندێکی تر دەڵێن: پێغەمبەری خودای. ٢١ـ عیسا وەڵامی دایەوە: تۆ ئەی سەرۆکی مالومەکان تۆ بۆ ئاشوب دانامرکێنیتەوە. ٢٢ ـ تۆش وەکی وان شێت بووی؟ ٢٣ـ ئایا کاتی پێغەمبەرایەتی بەسەر چووە! وەیا شەریعەتی خودات لە بیر چۆتەوە ئەی جولەکەی بەدبەخت کە شەیتان فریویداوی.

○ بەشی نەوەت وچوار: (٢١) برگەیە:

١ ـ کاتێ عیسا ئەمەی وت، جارێکی تر وتیەوە: من شایەتی دەدەم لە بەردەم ئاسمان، وە هەموو ئەوەی لەسەر زەوی نیشتەجێیە بە شایەت دەگرم، کە من دوورم لە هەموو ئەوەی خەڵکی دەیڵێت دەربارەی من کە من لە مرۆڤ گەورەتر بم.

٢ـ چون من لەدایك بووی ژنێکم، کە ملکەچی فەرمانی خودایە، ئەژیم وەك هەموو مرۆڤێك، وە توشی هەموو ناڕەحەتیەك دەبم وەك ئەوان.

○ بەشی نەوەت وپێنج: (٢٣) برگەیە:

(تێیدا وەصفێکی جوانی خوای بەرز و بڵند دەکات، وە لە هەموو ڕستەیەك کە مەسیح باسی دەکرد، مالومەکە شایەتی دەدا کەلە کتێبی پیرۆز دا باسی هاتووە)

٥ ـ عیسا بە ئاشکرا پێی وت: بەشێوەیەك دەکرێ هەموو کەس گوێی لێبێ: نوسراوە لە پەیمانی خودای زیندودا کە خواکەمان نە سەرەتای هەیە، نە کۆتایی هەیە. ٦ـ مالومەکە وەڵامی دایەوە : بەڵێ بەو شێوەیە نوسراوە.

(مەسیح بەردەوام بوو لە باسکردنی ئاکاری خوای دروستکەر، و مالومەکە شایەتی دەدا لەسەری)

○ بەشی نەوەت وشەش: (١٥) برگەیە:

٣ـ مالومەکە وەڵامی دایەوە: نوسراوە لە پەرتوکی موسا دا کە خواکەمان پێغەمبەرێ ـ مسیا ـ لە داهاتودا دەنێرێ، پێمان ڕا دەگەیەنێ کە خودا چی دەوێ، وە خێرو بەزەی دەهێنێ بۆ هەموو جیهان. ٤ـ بۆیە تکات لێدەکەین بەراستی پێمان بڵێ تۆی ئەو پێغەمبەرە کە چاوەڕوانین بێت؟ ٥ ـ عیسا وەڵامی دایەوە ڕاستە خودا ئەو وەعدەی داوە، بەڵام من ئەو پێغەمبەرە نیم چون ئەو لە پێش منا دروست بووە و لەدوای منیش دێت.

○ بەشی نەوەت وحەوت: (١٨) برگەیە:

١٤ ـ عیسا وەڵامی دایەوە: ناوی (مسیا) سەر سوڕهێنەرە، چون خوای گەورە خۆی ناوی نا کاتێ کە دروستی کرد و لە بەرزی ئاسماندا داینا. ١٥ ـ خوا دەفەرموێ: بە ئارام بە ئەی موحەمەد چون لە پێناوی تۆ بەهەشت و جیهان و خەڵکێکی زۆرم

دروستكردووه، تا پێشكەشی تۆی بكەم، پاشان ئەوەی تۆ بە پیرۆز دانێ ئەوە پیرۆزە، وەئەوەی نەفرین لە تۆ بكا ئەوە هەتا هەتایە نەفرین كراوە.

- بەشی نەوەت وهەشت: (٢٢) بڕگەیە:

(مەسیح نانێكی كەم دابەش دەكات بەسەر خەڵكێكی زۆر دا بۆ ئەوەی بیخۆن)

- بەشی نەوەت ونۆ: (١٤) بڕگەیە:

١ـ عیسا لە ئەشكەوتێك لە (تیرو) كە نزیك ئەردەنە خەڵوەت نشینی كرد، پاشان بانگی حەفتاو دوو كەس لەگەڵ دوازدە قوتابییەكەی كرد. ٢ـ پاش ئەوەی دانیشت لە سەر بەردێ هەموویانی لە تەنیشت خۆیەوە دانیشان، وە هەناسەیەكی قوڵی هەڵكێشاو وتی: ئەمڕۆ بینیمان تاوانێكی گەورە لە جولەكەكان، ئەوەی لە ناو جولەكەدا تاوانێكە كە دڵم دەكەوێتە خورپەوە لە سنگمدا لە ترسی خودا .

- بەشی سەد: (١٢) بڕگەیە:

(مەسیح وەسێتی بۆ قوتابییەكانی دەكات، كە ئامۆژگاری خەڵكی بكەن و دانایی بنوێنن، وهانی دان كە تەوبەبكەن، وەفەرمانی پێكردن كە هەمووی بڕوات بۆ وڵاتی سامرە و وڵاتانی جولەكە، بەڵام بەرنابا و یۆحەنا مانەوە لەگەڵیدا).

- بەشی سەد ویەك: (٢٣) بڕگەیە:

(مەسیح زیاتر ڕونكردنەوەی بەشی پێشوتر دەكات)

- بەشی سەد و دوو: (٢١) بڕگەیە:

(پەند وئامۆژگاری لە لایەن مەسیحەوە)

- بەشی سەدو سێ: (١٦) بڕگەیە:

(چەند قسەو وتەیەك كە عیسا ڕوبەڕوی قوتابییەكانی دەكات) .

- **بەشی سەد و چوار: (١٢) بڕگەیە:**

**( مەسیح وەلامی پرسیاری قوتابیەکانی دەداتەوە).**

- **بەشی سەد و پێنج: (٣٠) بڕگەیە:**

**(مەسیح باسی نەفس و چاکە و ڕۆژدی دەکات)**

- **بەشی سەد و شەش: (٢٠) بڕگەیە:**

**( مەسیح وەلامی پرسیارەکانی قوتابیەکانی دەداتەوە لەسەر نەفس و هەست و چێژ)**

- **بەشی سەد و حەوت: (٢٧) بڕگەیە:**

**(پەند و ئامۆژگارین لەسەر دورکەوتنەوە لە هەڵە، وە خۆ پاراستن لە تورەیی خودا)**

- **بەشی سەد وهەشت: (١٦) بڕگەیە:**

**(کۆمەڵێ نمونەو پەند و ئامۆژگاریە لەسەر نوستن و بەئاگا بونی نەفس و لاشە و بەندایەتی کردنی مرۆڤ بە نەفس).**

- **بەشی سەد و نۆ: (١٦) بڕگەیە:**

**٦ـ لەو کاتەدا ئەوەی دەنوسێ ـ واتە بەرنابا ـ وەلامی دایەوە: ئەی مامۆستا چۆن دەتوانین بەردەوام یادی خودا بکەین، پێمان وایە ئەم کارە مەحاڵە.٧ـ عیسا بە پێوە وەلامی دایەوە: ئەوەی تۆ دەیلێیت ئەی بەرنابا گەورەترین کارە کە مرۆڤ بیکات، چون مرۆڤ ناتوانێ لە سەر زەوی بەردەوام یادی خودا بکات .٨ـ جگە کەسانی پاك، ئەوان دەتوانن یادی خودا بکەن بەبەردەوام ، چون لە ناو دڵیاندا ڕۆشنایی ڕۆژی خودا هەیە، بۆیە ناتوانن خوایان لە یاد بچێ.**

- **بەشی سەد و دە: (٣٣) بڕگەیە:**

**(یادی بەردەوامی خودا، مرۆڤ دوردەخاتەوە لە هەڵە کردن)**

- بەشی سەد یانزە: (١٥) بڕگەیە:

(مەسیح کۆمەڵە نمونەیەك دەخاتە ڕوو، مەبەست لێی ئامۆژگاریە)

- بەشی سەد و دوانزە: (٢٢) بڕگەیە:

(وتوێژێ لە نێوان مەسیح و بەرنابا)

- بەشی سەد و سیانزە: (١٨) بڕگەیە:

(دەربڕینی کۆمەڵە نمونەیەك کە مەبەست لێی ئامۆژگاریە)

- بەشی سەد و چواردە: (٢٤) بڕگەیە:

١٠- بەو شێوەیە داودی باوکمان کە پێغەمبەری خودا بوو، دەڵێت: چونکە ئێمە کاتێ دەخۆین دەستەکانمان ماندو دەبێ، شکۆداری دەکەین، وە ئەوەش چاکە بۆمان.

- بەشی سەد و پانزە: (٢٠) بڕگەیە:

١١- یاقوب وەڵامی دایەوە: ئەی گەورەم مانای ئارەزوو چیە؟ ١٢- عیسا وەڵامی دایەوە: ئارەزەو - شهوة - شەیدایەکی نەبیسراوە، ئەگەر بە پێی ڕێنمایی ئەقڵ نەڕوا ئەوا سنوری دڵ و سۆز دەبەزێنێ.

- بەشی سەد و شانزە: (٢١) بڕگەیە:

(مەسیح باسی چیرۆکی پێغەمبەر ئیلیا لەگەڵ نابینایەکدا دەگێڕێتەوە)

- بەشی سەد و حەڤدە: (١٤) بڕگەیە:

(تەواو کردنی چیرۆکی پێشوترە)

- بەشی سەد و هەژدە: (١١) بڕگەیە:

(نمونەی چەند هەڵوێستێکی پێغەمبەرانی پێشوە وەك ئەرمیا و داود).

- بەشی سەد و نۆزدە: (٢٧) بڕگەیە:

٥ ـ هەر کەسێ تەماشای ژنێك بکات، خوای لە بیر بچێتەوە، کە ئەو ژنەی دروست کردوە، بۆ خێرو خۆشی مرۆڤ، ئەوا دیاری خۆشی ئەوێت و ئارەزووی دەکات. ٦ـ ئارەزوی هێندە زۆر ئەبێ تا وای لێدێت هەموو شتێکی خۆشی دەوێت کە لەو دەچێت، ئیدی بەهۆیەوە هەڵەیەك دروست دەبێ کە شایەنی گێڕانەوە نیە.

- بەشی سەد و بیست: (١٧) بڕگەیە:

بەرهەمی قسەی پڕو پوچ ئەوەیە: کە دڵ لاواز دەکات، بە شێوەیەك کەنا کرێ لەگەڵیدا ئامادەیی وەرگرتنی ڕاستی هەبێ.

- بەشی سەد و بیست ویەك: (٥) بڕگەیە

(باس لە تەوبەکردن دەکات)

- بەشی سەد و بیست ودوو: (٢٧) بڕگەیە

(مەسیح باسی خراپەی چاو چنۆکی دەکات، وەباسی نوێژ ، وە داوا لە خودا دەکات بەجۆرەها داواکردن وپاڕانەوە)

- بەشی سەد و بیست وسێ: (١٩) بڕگەیە

(مەسیح باسی چۆنیەتی دروست بونی مرۆڤ دەکات)

- بەشی سەد و بیست وچوار: (١٦) بڕگەیە

(مەسیح وەڵامی پرسیارەکانی یاقوب و ئەدۆراس دەداتەوە)

- بەشی سەد و بیست وپێنج: (٢٠) بڕگەیە

(باسی بەخشین و چاوچنۆکی دەکات)

٦ ـ ئێوە ئاگادار بن، با دەستی چەپتان نەزانێ کە دەستی ڕاستتان چی دەکات.

- بەشی سەد و بیست وشەش: (١٨) بڕگەیە

(مەسیح دەستخۆشی لە قوتابیەکانی دەکات دەیاننێرێ بۆ ناوچەکانی جولەکە وەپێیان دەڵێت: بڕۆن مژدە بدەن بەوە کە بیستوتانە) .

- بەشی سەد و بیست وحەوت: (٢٨) بڕگەیە

(وتارێکە کە پەند وئامۆژگاری تێدایە مەسیح دەیخوێنێتەوە بەسەر کۆمەڵێکی زۆر کەلای کۆبونەتەوە).

- بەشی سەد و بیست وهەشت: (١٨) بڕگەیە

(بەردەوام مەسیح ئامۆژگاری هەموان دەکات وەهانیان دەدا، تا نەکەونە هەڵەکاریەوە)

- بەشی سەد و بیست ونۆ: (٢٢) بڕگەیە

(لاوازی مرۆڤ بەرامبەر دەسەڵاتی خودا)

- بەشی سەد و سی: (١٥) بڕگەیە

(کۆمەڵە نمونەیەك کە مەبەستی ئامۆژگاریە)

- بەشی سەد و سی و یەك: (١٥) بڕگەیە

(گفتوگۆ لەنێوان مەسیح و یۆحەنای نێراو)

- بەشی سەد و سی و دوو: (٢٩) بڕگەیە

(مەسیح ئامۆژگاری خەڵکەکە دەکات لە نزیك کەناری دەریا)

- بەشی سەد و سی و سێ: (٢٥) بڕگەیە

(هەمووی پەند و ئامۆژکاریە)

- بەشی سەد و سی و چوار: (٢٠) بڕگەیە

(هەمووی پەند و ئامۆژکاریە).

- بەشی سەد و سی و پێنج: (٤٤) بڕگەیە

(تیایدا مەسیح وەڵامی پرسیاری پۆترۆس دەداتەوە...)

لەوکاتەدا پۆترۆس دەڵێت: ئەی مامۆستا پێمان بڵێ چۆن سزای سەرپێچیکەران دەدرێ، وەچەند لە جەهەنەم دەمێننەوە، تا لە تاوانەکانیان پاك ببنەوە؟

- بەشی سەد و سی و شەش: (٢١) بڕگەیە

٢٠- لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا دەڵێت: پەروەردگارم، خودام بیرت بێتەوە کە پەیمانت پێ دام من بەندەی تۆم، بەوەی کە ئەوەی ئاینی تۆی وەرگرت لە نێو جەهەنەمی هەتا هەتایی نایهێڵمەوە.

٢١ ـ خودا وەڵامی دەداتەوە: داوابکە بەوەی ئەتەوێ ئەی خۆشەویستم! چونکە بە تۆ هەموو شتێ ئەبەخشم.

- بەشی سەد و سی و حەوت: (٦) بڕگەیە

(پاڕانەوەی پێغەمبەری خودا  لە خوای گەورە بە ئازاد کردنی هەندێ تاوانکار لە ئاگر)

- بەشی سەد و سی و هەشت: (١٩) بڕگەیە

(مەسیح فەرمان بە خەڵکی دەکات کە بەڕۆژوو بن، و بپاڕێنەوەبۆ لابردنی قات وقڕی و زۆر بونی ڕنق و ڕۆزی)

- بەشی سەد و سی و نۆ: (٢٠) بڕگەیە

٢- بەرنابا و یعقوب و یۆحەنا دەستیان کردە گریان، وتیان: ئەی مامۆستا پێمان ناڵێت بۆچی ڕا دەکەیت لە ئێمە؟ ٣- ئێمە تۆمان دەوێ و غەمبارین، بەڵکە هەموو قوتابیان تۆیان دەوێ و دەگرین .٤- من بۆیە ڕام کرد زانیم سوپایەك لە شەیتانەکان خۆیان بۆ من ئامادە کردووە، لە ساتە وەختێکی نزیکدا. ٥- جا سەرۆکەکانی

مالومەکان و پیرانی گەل لەسەر سەرمەوە دەبن و داوا دەکەن لە فەرمانڕەوای ڕۆمانی کە بمکوژێ. ٦ـ چونکە ئەوان ئەترسن کە دەسەلاتی ئیسرائیلیان لەدەست بچیٚ.٧ـ سەرباری ئەمە یەکێ لە قوتابیەکانم من دەفرۆشێ و دەمدات بەدەستیانەوە هەر وەك چۆن یوسفیان فرۆشت لە میسردا. ٨ـ بەلام خودای دادپەروەر ئەو دەبەسێتەوە هەروەك چۆن بە داود پێغەمبەری وت (هەرکەسێ چاڵ بۆ براکەی هەلکەنێ ئەوا خۆی تێی دەکەوێت) بەلام خودا من ڕزگار دەکات لە دەستیان و دەمگوێزێتەوە بۆ جیهانێکی تر.

- بەشی سەد و چل: (٢٠) بڕگەیە

(پەند و ئامۆژگاریە ) .

- بەشی سەد و چل و یەك: (٢٢) بڕگەیە

١ـ پێم بڵێن مرۆڤ چۆن و چ کاتێ لە دایك دەبێ، بەڕاستی بە ڕووتی لەدایك دەبێ. ٣ـئەو چ سودی هەیە وە چۆن دەمرێ و دەنێژرێ لە خاکدا. ٤ـ هیچی پێ نابڕێ جگە لە پەڕۆیە نەبێ کە پێی دادەپۆشرێ، ئەوە پاداشتی جیهانە بۆی .

- بەشی سەد وچل و دوو: (٢٥) بڕگەیە

٧ـ لەدوای ئەوەی نیازی دڵی خۆیان کرد نوسەرو فەریسیەکان ئەوەی لە (ناریین) ڕوویدا گێرایانەوە.٨ـ کەوتنە ڕاوێژ لەگەڵ سەرۆکی مالومەکان وتیان: باشە چی بکەین ئەگەر ئەم پیاوە بوو بە پادشا؟ بەڕاستی بۆتە بەلایە بۆمان، ئەو ئەیەوێ چاك سازی بەندەی خودا بکا، لەسەر ئەو ڕێڕەوە کۆنە، چون نا توانێ داب و نەریتمان پوچەڵ بکاتەوە.

- بەشی سەد وچل و سێ: (١٦) بڕگەیە

(مەسیح دەچێ بۆ جەلیل ئامادەی خوانێك دەبێ لەگەڵ کەم دەست وهەژاراندا).

- بەشی سەد و چل و چوار: (١٥) بڕگەیە

(مەسیح بەرگری لە هەندێ هەڵەکار دەکات ، لەبەردەم مالومەکان دەڵێت: پێویستە چاکسازی بکرێ)

- بەشی سەد و چل و پێنج: (٤٩) بڕگەیە

(مەسیح مشت و مڕ دەکات لەگەڵ فەریسیەکان).

- بەشی سەد و چل و شەش: (٢١) بڕگەیە

٢ـ لەو کاتەدا عیسا وتی: ئەمڕۆ ئەم ماڵە ڕزگاری دەبێ، بەڕاستی زۆرێك لە عوشاریەکان و داوێن پیس و هەڵەکاران دەبرێن بۆ ژێر دەسەڵاتی خودا. ٤ـ وەهەروەها ئەوانیش کە پێیان وایە چاکەکارن بەرەو کڵپەو ئاگری هەتا هەتایی دەبرێن. ٥ـ کاتێ فەریسیەکان ئەمەیان بیست بەسەر شۆڕی ئەوێیان بەجێ هێشت.

- بەشی سەد و چل و حەوت: (١٧) بڕگەیە

(مەسیح چیرۆکێ دەگێڕێتەوە کە مەبەست لێی ئامۆژگاریە)

- بەشی سەد وچل و هەشت: (٢٢) بڕگەیە

١ـ ئەرێ پێم ناڵێن فەریسیەکانی ئەمڕۆ هەمان فەریسیەکانی جارانن؟ ئایا ئەوان خزمەتکاری خودان؟ ٢ـ نا نا قەت ئەوان نین. ٤ـ بەڵکە بە ڕاستی پێتان دەڵێم: لەسەر زەوی نیە شەڕو خراپەیەك هێندەی مرۆڤێك خۆی وەك زانا و پێشەنگی ئاین نیشان بدات و بەڵام خراپەکاریەکانی بشارێتەوە.

- بەشی سەد و چل و نۆ: (٢٨) بڕگەیە

(چیرۆکێ مەسیح دەیگێڕێتەوە کە مەبەست لێی ئامۆژگاریە).

- بەشی سەد و پەنجا: (٢٤) بڕگەیە

(تەواو کردنی چیرۆکی پێشوو کەبریتیە لە گفتو گۆیەکی بڕوادارانە لە نێوان دووکەسدا)

- بەشی سەد و پەنجاو یەك: (١٩) بڕگەیە

(چەند ئامۆژگاریەك لەلایان مەسیحەوە بۆ قوتابیەکانی و شوێن کەوتوان و خۆشەویستانی کە باوەڕیان پێ هێناوە)

- بەشی سەد و پەنجاو دوو: (٢٧) بڕگەیە

(وتووێژێك لەنێوان مەسیح و سەربازە ڕۆمانیەکان)

- بەشی سەد وپەنجاو سێ: (٢٦) بڕگەیە

١ـ مالوم و فەریسەکان کەوتنە خیانەت لەناو خۆیاندا. ٢ـ وتیان: ئەو دانایی (بەعل و عەشتاروت)ی بۆ هاتووە، بەڵکو ئەوەی دەیکات بە پاڵپشتی شەیتانە.

- بەشی سەد و پەنجاو چوار: (٢٦) بڕگەیە

٢٤ ـ ئەگەر خودا کەسێ دروست بکات نەتوانێ کارێکی هەڵە بکات، ئەوە هاو وێنەی خودایە لەو کارەدا .

- بەشی سەد و پەنجاو پێنج: (٢٠) بڕگەیە

(مالومە جولەکەکان و فەریسەکان بەخراپە مامەڵەیان لەگەڵ مەسیحدا دەکرد)

- بەشی سەد و پەنجاو شەش: (٣٤) بڕگەیە

(مەسیح نابینا و کوێرێکی زگماك بە ویستی خوا چاك دەکاتەوە).

- بەشی سەد و پەنجاو حەوت: (٧) بڕگەیە

(مالومە جولەکەکان و فەریسەکان پرسیاریان لەو نابینایە دەکرد کە مەسیح چاکی کردبۆوە)

- بەشی سەد وپەنجاو هەشت: (٢٥) بڕگەیە

(چەند پەند و ئامۆژگاریەك)

- بەشی سەد و پەنجاو نۆ: (٢٣) بڕگەیە

(ئەو ئازارو ناڕەحەتیانەی کە دووچاری پێغەمبەران بۆتەوە لەڕێی بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان)

- بەشی سەد و شەست: (٣١) بڕگەیە

(باسی هەندێ لە پێغەمبەران و چەند هەڵوێستێکیان دەکات).

- بەشی سەد وشەست ویەك: (٢٣) بڕگەیە

(باسی هەڵەی درۆ و کوشتن و خراپە دەکات)

- بەشی سەد وشەست و دوو: (٨) بڕگەیە

( تەواو کردنی بابەتی پێشووە)

- بەشی سەد وشەست وسێ: (١١) بڕگەیە

(باسی پێغەمبەر موحەمەد (درودی خوای لێبێت) دەکات)

٨ـ عیسا بەدڵخۆشیەوە وەڵامی دایەوە وتی: ئەوە موحەمەد نێراوی خودایە. ٩ـ هەرکاتێ هاتە دونیاوە ئەوە دەبێتە هۆکارێ کە کرداری چاکە لە نێو خەڵکدا زۆر بێ، بەهۆی ئەو بەزەییە زۆرەوە کە پێوەی هاتووە.١١ـ ئەو هەورێکی سپییەی پڕە لە بەزەیی خودا، ئەو بەزەییە کە خوا بڵاوی دەکاتەوە بەسەر بڕوادارانەوە بارانێکی بەخوڕە.

- بەشی سەد و شەست و چوار: (٢١) بڕگەیە

(مەسیح باسی ویستی مرۆڤ دەکات، لە بەدیهاتنی کاری چاکەو خراپە، وڕاڤەی ئەو بابەتە دەکات، کە ئایا مرۆڤ سەرپشکە و بەویستی خۆی کار ئەنجام دەدا؟ یا ویستی نیەو هەمووی لەلایەن خوداوە پێیدەکریّ).

- بەشی سەد و شەست وپێنج: (١٢) بڕگەیە

٤ـ خوای گەورە لە سەر زمانی پێغەمبەر ئەشعیاوە دەڵێت: بانگم کردن بەڵام گویّ بیستم نەبوون. ٦ـ ئای خودا چەند بانگی دەکرد. ٦ ـ گویّ ڕادێرن بزانن لە سەر زمانی ئەم پێغەمبەرەوە چی فەرمووە: دەستی ڕاخستوە بەدرێژایی ڕۆژ بۆ گەلێك کەچی بەڕاستیان نەدەزانیم و پێچەوانەوە بوون لەگەڵم.

- بەشی سەد و شەست و شەش: (١٢) بڕگەیە

(هەروەك لە بەشەکانی پێشوو مەسیح باسی چۆنیەتی دەرخستنی ڕاستی لە چەوتی دەکات و چۆن مرۆڤەکان سەرپشکن لەو کارەدا)

- بەشی سەد و شەست و حەوت: (١٥) بڕگەیە

٥ـ چۆن تێدەگەن کە خودا هەر لە ئەزەلەوە هەیە.٦ـ بەڕاستی قەت لەمە تێناگەن.٧ـ چونکە مرۆڤ دروستکراوێکی دیاری کراوە، دەچێتە ناو لاشەیەوە وەك پێغەمبەر سولێمان دەڵێت: قابلی خراپەکاریە و دەکەوێتە ژێر باڵە پەستۆی نەفسەوە، چون کرداری خودا هاو شێوەی خۆیەتییە، ئیدی چۆن مرۆڤەکان دەتوانن پەی پیّ بەرن.

- بەشی سەد و شەست و هەشت: (٦) بڕگەیە

(مەسیح وەڵامی پرسیاری قوتابیەکانی دەداتەوە)

- بەشی سەد وشەست و نۆ: (٢٠) بڕگەیە

(باسی بەهەشت دەكات، وەچۆن نەفسی مرۆڤەكان تێیدا ئاسودەیە)

- بەشی سەد و حەفتا: (٨) بڕگەیە

١ـ بەم شێوەیە خوای گەورە دەفەرموێ بۆ ئەو پیاوەی دەیەوێ بەدڵسۆزی كار بكات. ٢ـ بزانە چ كارێك ئەنجام دەدەی وبزانە كە تۆ بۆ منی دەكەیت. ٣ـ سوێند بە خۆم من هەتا هەتاییم خۆشەویستی تۆ هیچ لە من زیاد ناكات.

- بەشی سەد و حەفتاو یەك: (٩) بڕگەیە

(بڕواداران لە بەهەشتان)

- بەشی سەد و حەفتاو دوو: (٤) بڕگەیە

(مەسیح باسی بەخششی خودا دەكات بۆ سەر خەڵكی)

- بەشی سەد و حەفتاو سێ: (٢٦) بڕگەیە

(دوا ڕۆژی چاك بۆ بڕوادارانە)

- بەشی سەد و حەفتاو چوار: (١١) بڕگەیە

١ ـ سوێند بەو خودایەی كە نەفسی من لە بەردەمیایەتی، خوا بە بەزەیی خۆی پەیمانی داوە بە هەڵەكاران و دەڵێت: سوێند بەنەفسی خۆم ئەو كاتەی كە هەڵەكارێ لە هەڵەكەی پاشگەز ئەبێتەوە، ئەوە ئەوكاتە منیش بەهەمیشەیی تاوانەكەیم بیر ئەچێتەوە.

- بەشی سەد و حەفتاو پێنج: (٢) بڕگەیە

(باسی وتەو قسەی پێغەمبەر ئەشعیا دەكات )

- بەشی سەد و حەفتاو شەش: (١٦) بڕگەیە

( مەسیح باسی نەفس و لاشەی بڕواداران دەكات لە بەهەشتدا)

- بەشی سەد و حەفتاو حەوت: (٨) بڕگەیە

(باسی بەهەشت دەکات)

- بەشی سەد و حەفتاو هەشت: (١٢) بڕگەیە

(وەڵامی مەسیح بۆ ئەو پرسیارانەی کە قوتابی و بڕواداران ئاراستەیان دەکرد)

- بەشی سەد و حەفتاو نۆ: (١٤) بڕگەیە

(مەسیح باسی گەورەیی خودا دەکات ، پاشان نوێژ دەکات لەگەڵ قوتابیەکانی)

- بەشی سەد و هەشتا: (١٣) بڕگەیە

(مەسیح وەڵامی ئەو پرسیارانەی دایەوە کە لەسەر خواوەند لێی دەکرا)

- بەشی سەد و هەشتا و یەك: (١٨) بڕگەیە

(مەسیح وەڵامی پرسیارەکانی بەرنابا دەداتەوە)

- بەشی سەد و هەشتا و دوو: (٣٢) بڕگەیە

(مەسیح باسی پاداشت و سزا دەکات، لەگەڵ ئەرکی ئەو دوو فریشتە چاکەی کە دەینوسنەوە)

- بەشی سەد و هەشتا و سێ: (١٥) بڕگەیە

(مەسیح باسی خۆبەکەم زانی دەکات)

- بەشی سەد و هەشتا وچوار: (١٣) بڕگەیە

(مەسیح باسی جیاوازی نێوان خۆبە کەمزانی و خۆ بەزلزانی دەکات)

- بەشی سەد و هەشتا و پێنج: (١٦) بڕگەیە

(مەسیح باسی کاری چاکەو پاداشتی دەکات، و باسی کاری خراپەو سزای دەکات)

- بەشی سەد و هەشتا شەش: (٧) بڕگەیە

(لێرەدا مەسیح باسی هەڵوێستی دۆستانی خودا و بڕواداران دەکات).

- **بەشی سەد و هەشتا و حەوت: (٢٧) برگەیە**

**(باسی دۆستانی خوداو هەڵوێستیان دەکات)**

- **بەشی سەد و هەشتا و هەشت: (٣٤) برگەیە**

**( تەواو کردنی چیرۆکی (هۆشع) وە دەرهێنانی پەندو ئامۆژگاری لێی)**

- **بەشی سەد و هەشتا و نۆ: (١٦) برگەیە**

**(تەواو کردنی چیرۆکی پێشوو)**

- **بەشی سەد و نەوەد: (١٠) برگەیە**

**(مەسیح بۆ بەرنابای ڕون دەکاتەوە، کە پێغەمبەر موحەمەد لە نەوەی ئیسماعیلە نەك لەنەوەی ئیسحاق)**

- **بەشی سەد و نەوەد و یەك : (١٠) برگەیە**

**(تەواوکردنی گفتوگۆی پێشووە)**

- **بەشی سەد و نەوەد و دوو: (١٥) برگەیە**

**(داواکردنی مەریەمەی مەجدەلی لە مەسیح بۆ چارەسەری نەخۆشی براکەی).**

- **بەشی سەد و نەوەد و سێ: (٣٦) برگەیە**

**(مردنی لیعازری نەخۆش و زیندوبونەوەی دوای چوار ڕۆژ، بە بەرەکەتی مەسیح پاش ئەوەی ویستی خوای لەسەر بوو)**

**٣١ـ عیسا هەستا لە سەر تەرمی مردووەکە. ٣٢ـ پاشان عیسا بە قوتابیەکانی وت: بیکەنەوە. ٣٣ـ چونکە بەسترابۆوە، بە پۆشاکی گۆڕ، لەگەڵ چەند دەستەسرێکدا کە لەسەر دەموچاوی دانرابوو، هەروەك باوو باپیرانمان بەو شێوەیە مردوو دەنێژن.**

**٣٤ـ زۆرێك لە جولەکەکان و هەندێ لە فەریسیەکان باوەڕیان هێنا بە عیسا چون ئەو موعجیزەیە زۆر گەورەبوو. ٣٥ ـ بەڵام ئەوانەی ئامادەبوون و باوەڕیان نەهێنا،**

ئەوێیان بەجێ هێشت و ڕۆشتن بەرەو ئۆرشەلیم، وە هەواڵی زیندووبوونەوەی لیعازریان دا بە سەرۆکی مالومەکان کە زۆرێك لەخەڵکی بونەتە ناسری.٣٦ـ چونکە بەو شێوەیە ئەوانەی بانگی دەکردن بۆ تەوبەکردن بە ناوی خوداوە بوو کە مەسیح مژدەی پێدەدان.

- بەشی سەد و نەوەد و چوار: (١٣) بڕگەیە

١ـ نوسەرو فەریسیەکان کەوتنەوتوێژ لەگەڵ سەرۆکی مالومەکان بۆ کوشتنی لیعازر.

٢ ـ چون زۆرێك لە خەڵکی وازیان لە داب و نەریتی ئەوان هێناو باوەڕیان بە پەیامی عیسا هێنا، چونکە زیندووبوونەوەی لیعازر زۆر کارێکی گەورە بوو، چونکە لیعازر دوای زیندووبوونەوە قسەی کرد و نان و ئاوی خوارد.

- بەشی سەد و نەوەد و پێنج: (١٥) بڕگەیە

٩ ـ ئیدی نابێ هاوڕێیانمان بگرین، چ کاتێ بینیان هاوڕێیەکیان مردووە، چون خواکەمان ویستی وابووە. ١١ـئەگەر لاشە بەبی یەکگرتنی لەگەڵ نەفس دروست نەبێ و جێی ناخۆشی بێ ، ئەوە نەفس بەبێ یەکگرتنی لەگەڵ خودا خراپتر ئەبێ ناخۆش ترە.

- بەشی سەد و نەوەد و شەش: (١٥) بڕگەیە

(وتوێژی مەسیح لەگەڵ یۆحەنا)

- بەشی سەد و نەوە و حەوت: (١٣) بڕگەیە

(مەسیح وەڵامی پرسیارەکانی یۆحەنا دەداتەوە لە سەر مردن وژیان).

- بەشی سەد و نەوەد و هەشت: (٢٠) بڕگەیە

(مەسیح دان بەوەدا دەنێ، کە نە خودایە، نە (مسیا) یە، واتە پێغەمبەری چاوەڕوانکراو نیە)

- بەشی سەد و نەوەد و نۆ: (٤) بڕگەیە

(مەسیح دەڵێ فرمێسکی تەوبەکار لە هەڵە ئاگری جەهەنەم دەکوژێنێتەوە، ئەو ئاگرەی کە ئاوی هەزاران دەریا ناتوانێ بیکوژێنێتەوە)

- بەشی دووسەد: (١٦) بڕگەیە

٣ـ جەژنی فەصحی جولەکە نزیك بۆتەوە، بۆیە عیسا بە قوتابیەکانی وت: بابڕۆین بۆ ئۆرشەلیم تا بخۆین لە مەڕی جەژنی فەصح. ٤ـ پۆترۆس و یۆحەنای نارد بۆ شار، وەپێی وتن: لە تەنیشت درگای شار ماکەرێ لەگەڵ جاشێك دەبینن، بیانگرن وبیان هێنن بۆ ئێرە، چون پێویستە سواریان ببین، پێیان بڵێن بۆ ئۆرشەلیم.
٦ـ کاتێ پرسیاریان لێکردن بۆ کوێی ئەبەن؟ پێیان بڵێن: مامۆستا ئیشی پێیان هەیە، ئەوجا ڕێتان پێ دەدەن.
(کاتێ عیسا گەیشتە شارەکە خەڵکی پۆشاکی خۆیان ڕاخست لە بەر پێی ماکەرەکەدا، پیرۆز بێ ئەوی هات کە نێراوە بەناوی خودای پەروەردگارەوە، بەخێر بێیت ئەی کوڕی داود)

- بەشی دووسەد ویەك: (١٩) بڕگەیە

٦ـ دوای ئەوەی کە عیسا چووە پەرستگاکەوە، نوسەرە فەریسیەکان ژنێك کە لەداوێن پیسی گیرا بوو هێنایان بۆلای. ٧ ـ بەردەوام بوون لەوەی کە وەڵامێکیان دەست بکەوێ، عیسا هەستایە سەرپێ و دەستی بۆلای ژنەکە ڕاکێشاو وتی: هەرکەس لە ئێوە تاوانی نەکردووە با ئەو یەکەم کەس بێ بچێت بەردبارانی بکات.

٩ ـ كاتێ خەڵكەكە ئەمەی بیست یەك یەك چونە دەرێ هەر لە پیرەكانیانەوە هەتا دواییان، چون تەریق دەبونەوە گەر تاوانەكانیان دەربكەوتایە.

- بەشی دووسەد و دوو: (٢٢) بڕگەیە

(عیسا ڕەخنەی توند لە نەوەی ئیسرائیل دەگرێ، بەهۆی ئەوەی كە لە شەریعەتی ڕاستی موسا دووركەوتوونەتەوە)

- بەشی دووسەد و سێ: (١٦) بڕگەیە

(خودا هەڕەشە لە ئۆرشەلیم و نەوەی ئیسرائیل دەكات لەسەر زمانی عیساوە).

- بەشی دووسەد وچوار: (١٠) بڕگەیە

(تەواو كەری باسی پێشوو)

- بەشی دووسەد و پێنج: (١٨) بڕگەیە

٨ـ عیسا وەڵامی دایەوە: ئەی یەهوزا من دەزانم چی لەدڵتایە، بەرامبەر هەموو شتێكت پێدەبەخشم. ١٢ـ چون ئەو یەك لەسەر دەی ئەوەی بە عیسا دەگەیشت دەیدزی. ١٣ـ یەهوزا ڕۆشت بۆ بینینی سەرۆكی مالومەكان، كە هەموو لە شوێنێكدا كۆبووبوونەوە بۆ وتوێژ كردن هەر لە مالوم نوسەر و فەریسیەكان. ١٤ـ یەهوزا چوو قسەی لەگەڵ كردن، پێی وتن: ئێوە چیم دەدەنێ كە عیساتان بدەم بەدەستەوە، ئەو كەسەی كە دەیەوێ خۆی بكا بە پاشا بەسەر ئیسرائیلیەكانەوە.

١٥ـ وەڵامیاندایەوە وتیان: چۆن دەیدەیتە دەستمان؟ یەهوزا وەڵامی دانەوە: كاتێ بیستم ئەو دەڕوات بۆ دەرەوەی شار بۆ ئەوەی نوێژ بكات، پێتان دەگەیەنم و پێتان دەڵێم: ئەو جێگەیەی كەئەوی لێیە لە كوێیە.١٧ـ چونكە ناكرێ دەستگیری بكەن لە ناوشاردا چون ئاشوبی لێ دەكەوێتەوە. ١٨ـ سەرۆكی مالومەكان وەڵامی

دایەوە: ئەگەر بیدەیتە دەستمان ئەوە سێ پارچە ئاڵتونت دەدەینێ ، وە دەزانی چ مامەڵەیەکی باشت لە گەڵ دەکەین.

- بەشی دووسەد وشەش: (١٨) بڕگەیە

(وتوێژ لە نێوان مەسیح و سەرۆکی مالومەکان، کە سەرۆکی مالومەکان عیسای تاوانبار کرد بەوەی کە ئەیەوێ ببێتە پاشای ئیسرائیلیەکان، بەڵام مەسیح ئەمەی پوچەڵ دەکردەوە).

- بەشی دووسەد و حەوت: (١٢) بڕگەیە

( تەواو کردنی ئەو وتوێژەی پێشووە)

- بەشی دووسەد و هەشت: (١٧) بڕگەیە

٧ـ بەڕاستی پێتان دەڵێم: ئەو کوڕەی ئیبراهیم ئیسماعیلە کە لەنەوەی ئەوە ـ مسیا ـ پێغەمبەری چاوەڕوانکراو دێت، کە پەیمان دراوە بە ئیبراهیم کە لەنەوەی ئەو کەسێ بێت، کە هۆزەکانی زەوی کۆبکاتەوە. ٨ ـ کاتێ سەرۆکی مالومەکان ئەمەی بیست تورە بوو وە هاواری کرد، با ئەم خراپەکارە بەردباران بکەین چون ئەمە ئیسماعیلیە، وە لایداوە لە موسا و شەریعەتی خودا.

- بەشی دووسەد و نۆ: (٤) بڕگەیە

١ـ لەو کاتەدا جوبرەئیل سەردانی مەریەمی دایکی عیسای کرد کە هەمیشە لە نوێژو خواپەرستیدا بوو. ٢ـ جا بۆی گێڕایەوە کە چۆن کوڕەکەی لە ژێر ئەشکەنجەدایە، وتی: ئەی مەریەم نەترسی چون خودا دەیپارێزێ لە هەموو خەڵکی. ٣ـ ئیدی مەریەم بەگریانەوە ڕۆشت لە ناسریەوە بۆ ئۆرشەلیم بۆ ماڵی مەریەمی سالومە خوشکی بۆ ئەوەی کوڕەکەی ببینێتەوە.

○ بەشی دووسەد و دە: (٣١) بڕگەیە

١٠ ـ سەرۆکی مالومەکان بەشێوەیەك کەوتە قسە کەزۆریێ لە خەڵکی هەڵگەڕانەوە لە عیسا. ١١ـ بەوە ئەشکەنجەی نهێنی بوو بە ئەشکەنجەیەکی ئاشکرا. ١٢ـ هەتا وای لێهات سەرۆکی مالومەکان خۆی چوو بۆ لای هێرۆدس فەرمان ڕەوای ڕۆمانیەکان، وە تێیگەیاندن بەوەی کە عیسا دەیەوێ ببێتە پاشای ئیسرائیل.

١٣ـ لەسەر ئەمەش چەند کەس هەیە کە شایەتی درۆدەدەن. ٢٦ ـ هێرۆدس هەستا و هەڕەشەی لە فەرمان ڕەوای ئەوێ کرد، وتی : ئاگادار بە لەوەی سۆز و بەزەییت بۆ ئەو پیاوە ببێتە هۆیەك کە ئاشوبێ بەرپا ببێ لە وڵاتدا. ٢٧ـ ئەودەم من تۆ تاوان بار دەکەم بە لادەر لەلای قەیسەر. ٢٨ـ لەو کاتەدا فەرمان ڕەوا ترساو لەگەڵ پیران و ئاشتەوای لەگەڵ هێرۆس کرد، پاش ئەوەی کە ڕقیان لە یەکتر بوو تا پلەی مردن. ٢٩ـ ڕێککەوتن لەسەر کوشتنی عیسا، ووتیان بە سەرۆکی مالومەکان: چ کاتێ زانیتان تاوانبار لە کوێیە ئەوا چەند سەربازێکت بۆ دەنێرین.

٣٠ـ ئەو هەستاوە بەوەی کە پێغەمبەرایەتی داود تەواو بکات، ئەو داودەی کە هەواڵی دابوو بە وەی یەسوع پێغەمبەری ئیسرائیلە، وتویەتی: ئەمیر و پاشاکانی سەرزەوی یەك ئەگرن لە سەر پیرۆزی ئیسرائیل، چون بانگەوازی بۆ ڕزگاری هەموو جیهانە.

○ بەشی دووسەد و یانزە: (١٠) بڕگەیە

١ـ لەو کاتەی عیسا لە ماڵی نیقۆدیمۆس بوو، لە پشت جۆگەی (قدرون)[1] بە قوتابیەکانی وت: ئەو کاتە نزیك بۆتەوە کە تێیدا لەم جیهانە دەڕۆم. ٢ـ بەئارام بن و غەمبار نەبن چون من دەڕۆم، وە هەست بە هیچ ناڕەحەتیەك ناکەم.

○ بەشی دووسەدو دوانزە: (٢٠) بڕگەیە

(مەسیح نوێژ دەکات و دەست بەرزدەکاتەوە بۆ لای پەروەردگار، وە داوا لە خودا دەکات کە لە تاوانکاران خۆش ببێت، بەڵام لەو کەسە خۆش نەبێ کە پێی وایە من کوڕی خوام)

○ بەشی دووسەد و سیانزە: (٣٠) بڕگەیە

٥ـ پاشان لای کردەوە بەلای یەهوزا، وتی: ئەی هاوڕێ بۆ دواکەوتی ٦ـ ئەوە کاتم نزیکبۆتەوە برۆ ئەوە بکە کەپێویستە بیکەیت. ٧ـ قوتابیەکان گومانیان برد کە عیسا یەهوزا دەنێرێت، کە شت بکڕێ بۆ ڕۆژی فەصح. ٨ـ بەڵام عیسا دەیزانی کە یەهوزا نزیکە بیدا بەدەستەوە. ٩ـ بۆیە ئەوەی وت، چون حەزی دەکرد کە بڕوات لەم جیهانە.

○ بەشی دووسەد و چواردە: (١٠) بڕگەیە

١ـ عیسا لە ماڵ چووە دەرێ، بەرەو بێسانەکە، بۆ ئەوەی نوێژ بکا، وەك نەریتی بوو لە نوێژ کردنا سەد جار کرنوشی برد، کە نێوچەوانی تۆزاوی بوو. ٢ـ کاتێ یەهوزا ئەو جێی زانی کە عیساو قوتابیەکانی لێن، ڕۆشت بۆ لای سەرۆکی

[1] لەدەقە عەرەبیەکەو لە چەند نوسخەیەکی ئینجیلی بەرنابا بەم شێوەیە هاتووە: (وراء جدول قدرون) وادیارە کە ئەمە شوێنێکە لە ئورشەلیم ، زۆریش ·گەڕام لەسەرچاوەکان تا ئەمەم بۆ ڕون بێتەوە بەڵام بەداخەوە هیچی وام نەدیتەوە، بۆیە بە تێگەیشتنی خۆم ئەوەیە کەنوسیومە.وەرگێڕ.

مالومەکان. ٣ـ پێی وت: ئەگەر ئەوەی بەڵێن وایە بمدەیتێ ئەوە ئەمشەو پێت دەڵێم عیسا لەکوێیە. ٤ـ چون هەر خۆی و یازدە قوتابیەکەیەتی.٥ـ سەرۆکی مالومەکان وتی چەندت دەوێ؟ ٦ـیەهوزا وتی: سی پارچە ئەڵتون. ٧ـ دەست بەجێ سەرۆکی مالومەکان پارەکەی بۆ بژارد. ٨ـ پاشان فەریسەیەکی نارد بۆلای فەرمان ڕەوا و بۆلای هێرۆدس بۆ ئەوەی سەربازەکان بنێرێ. ٩ـ لەشکرێکی پێدان، چون دەترسان لە گەل.١٠ـ خۆیان و چەکەکانیان دەرچون لە ئۆرشەلیم، چرایان هەڵگرد و مەشخەڵیان کرد بە گۆچانەکانیانەوە.

- بەشی دووسەد و پانزە: (٦) بڕگەیە

١ـ کاتێ سەربازەکان و یەهوزا نزیك بونەوە لەو شوێنەی کە عیسای لێی بوو، عیسا بیستی لەنزیکەوە دەنگێکی زۆر. ٢ـ بۆیە گەڕایەوە بۆ ماڵ بەترسەوە. ٣ـ ئەو یازدە قوتابیەشی نوستبون. ٤ـ کاتێ خودا بینی مەترسی لەسەر بەندەی خۆی نزیك بۆتەوە، فەرمانی دا بەفریشتەکانی جوبرەئیل و میخائیل و ڕەفائییل و ئوریول، کە بچن عیسا بهێنن لە جیهانەوە. ٥ـ فریشتە پاکەکانی خودا هاتن و عیسایان لە پەنجەرەکەی کە دەیڕوانیە باشور. ٦ـ هەڵیان گرت و دایان نا لە ئاسمانی سێیەم، بە هاوڕێیەتی ئەو فریشتانەی کە هەمیشە پاك و بێگەردی بۆ خودا دەکەن.

- بەشی دووسەد و شانزە: (١٣) بڕگەیە

١ـ یەهوزا زۆر بە توندی چووە ناو ئەو ژورەی کە عیسای تێدا بەرز کرایەوە.

٢ـ وە قوتابیەکان هەمویان خەوتبوون. ٣ـ خوای سەر سوڕهێنەر کارێکی سەرسوڕهێنەری کرد. ٤ ـ یەهوزا گۆڕا لە قسەکردن لە دەم وچاو وەك عیسای لێهات، هەتا ئێمەش باوەڕمان وا بوو کە عیسایە. ٥ـ بەڵام ئەو کاتەی ئێمە بەخەبەر هاتین دەگەڕا بزانێ مامۆستا لە کوێیە. ٦ـ بۆیە ئێمە وەڵاممان دەدایەوە وتمان

تۆی گەورە تۆ مامۆستامانی. ٧ـ ئێمەت بیر چۆوە. بەڵام ئەو پێنەکەنی ئەیوت: ئایا ئێوە تێك چوون؟ هەتا یەهوزای ئەسخەریوتی ناناسنەوە!؟ ٩ ـ لەو کاتەی کە ئەم قسانەی دەکرد، سەربازەکان خۆیان کرد بە ژوورا، دەسی یەهوزایان بەست، چون زۆر لە عیسا دەچوو لە هەموو ڕویەکەوە. ١٠ـ بەڵام ئێمە کەقسەی یەهوزامان بیست و بینیمان کۆمەڵە سەربازەکە، وەك شێت بۆی دەرچووین.

○ بەشی دووسەد و حەڤدە: (٨٨) بڕگەیە

١ـ سەربازەکان بە گاڵتە پێکردنەوە یەهوزایان برد. ٢ـ چون ئەو ئینکاری دەکەرد ـ کە ڕاستیش بوو ـ کە عیسایە. ٣ـ سەربازەکان بە گاڵتەوە پێیان دەوت: گەورەمان مەترسە بۆیە تۆمان هێناوە بۆ ئەوەی بتکەینە پاشای ئیسرائیلیەکان. ٧ـ ئیدی سەربازەکان ئارامیان لە بەر بڕا، دەستیانکردە سوکایەتی کردن بە یەهوزا لێیان دەدا، بە پەتێکەوە ڕایاندەکێشا تا بردیانە ئۆرشەلیم.٩ـ جا یەهوزا بەچەند قسەیەکی شێتانە کەوتە قسە. ١٠ ـ بۆیە هەموو سەرسام مابوون پێ ئەکەنین، پێیان وابوو کە عیسایە، بەڵام خۆی کردۆتە شێت لە ترسی مردن. ١١ـ بۆیە سەربازانی لەشکرەکە بە پەڕۆیەك هەر دوو چاویان بەست. ١٢ ـ بەگاڵتەوە پێیان دەوت: ئەی عیسای پێغەمبەری ناسریەکان (بەم شێوەیە بانگی ئەو باوەڕدارانەی کەباوەڕیان بە عیسا هەبوو دەکرد) پێمان بڵێ: کێ لێیدای؟ ١٣ـ زلەیان لێرەدا تفیان لە نێو چەوانی دەکرد. ١٤ ـ بۆ بەیانی کۆڕێکی گەورەیان لە نوسەران و پیرانی گەل لێ کۆکردەوە.١٥ـ سەرۆکی مالومەکان لەگەڵ فەریسیەکان داوای ئامادە بوونی شایەتەدرۆکانیان کرد، ١٦ـ چون پێیان وابوو یەهوزا عیسایە.

١٧ـ بەڵام هیچیان دەست نەکەوت، بەڵکو هەموو قوتابیان لەگەڵ ئەوەی ئەمەدەنوسێ هەمان بۆچونیان هەبوو.١٨ـ لەوەش زیاتر دایکە پاکە بەسەزمانەکەی

عیسا لەگەڵ خزمان و هاوڕێیانیدا لە سەر ئەو بۆچونەبوون. ١٩ ـ هەمووان بەشێوەیەك غەمبار بوون کە بێئەندازە بوو. ٢٠ـ سوێند بە خوا ئەوەی ئەمە دەنوسیێ هەمووی ئەوەی کەعیسا دەیوت بیری چوبۆوە لەوەی کەبەرز دەکرێتەوە، وە کەسێکی تر بەناوی ئەوەوە ئەشکەنجە دەدرێ، وە نامرێت تا نزیکبونەوەی نەمانی جیهان. ٢١ـ بۆیە ئەوەی دەنوسێ لەگەڵ دایکی عیسا و یۆحەنا ڕۆشتن بۆ لای خاچەکە. ٢٢ـ پاشان سەرۆکی مالومەکان فەرمانی دا کە عیسا بەباڵ بەسراوی بهێنێتە پێشێ. ٢٣ ـ پرسیاری قوتابیەکان و بەرنامەکەی لێکرد. ٢٤ ـ یەهوزا وەڵامی هیچی نەدایەوە هەروەك ئەوەی تێك چوبێ. ٢٥ـ پاشان سەرۆکی مالومەکان سوێندی دا بە خودای زیندوی ئیسرائیل کەبەڕاستی بدوێ. ٢٦ـ یەهوزا وەڵامی دایەوە پێشتر پێم وتن من یەهوزای ئەسخەریوتیم کە پەیمانم پێدان کە عیسای ناسریتان بۆ بهێنمە بەردەست، ٢٧ـبەڵام نازانم بە چ مەرامێ ئێوە تێکچون!

٢٨ـ بەهەر شێوەیەك بێ ئەتانەوێ بڵێم من عیسام. ٢٩ـ سەرۆکی مالومەکان وەڵامی دایەوە وتی: ئەی گومڕای گومڕاکەر، تۆ بەو بەرنامەو ئایەتە درۆیانەی کە دەیڵێیت هەموو ئیسرائیلیەکانت لە جەلیلەوە تا ئۆرشەلیم لەخشتە برد. ٣٠ـ ئێستا پێت وایە ڕزگارت دەبێ لە سزا. ٣١ـ وەبەچەشنێ خۆت دەرخستووە کە شێت بووی.

٣٢ـ دوای ئەم قسانە، فەرمانی بەکارەکەر و بەردەستەکانیدا کە باشتر لێیدەن وسوکایەتی پێ بکەن، تا عەقلی بێتەوە سەرخۆ. ٣٣ـ بەشێوەیەك بوو بەگاڵتەجاری خزمەتکارەکان کە ئەندازەی نەبوو.٣٤ـ بەچەندەها شێوازی نوێ گاڵتەیان پێدەکرد تا کۆڕەکە بکەونە پێکەنین.٣٥ـ ئینجا بەرگی جادوکەرەکانیان لەبەر کرد، وبەدەست و بەقاچ کەوتنە لێیانی بەشێوەیەك کە کەنعانیەکانیش بەزەییان بەحاڵیدا دەهاتەوە.٣٧ـ پاشان بەدەست بەسراوەیی بردیانە لای والی کە لەژێرەوە

عیسای خۆش دەویست. ٣٨- کاتێ گومانی برد کە یەهوزا عیسایە،٣٩- هێنایە ژورەکەی خۆی قسەی لەگەڵ کرد ولێی پرسی بۆچی سەرۆکی مالومەکان و گەل هەموو تۆیان گرتوەو هێناویانیتە بەردەستی من؟ ٤٠- یەهوزا وەلامی دایەوە: وتی ئەگەر ڕاست بڕۆم ئەوە باوەڕم پێناکەی، چون تۆش وەك مالوم و فەریسیەکان هەڵ خەڵەتاوی. ٤١ - والی وەلامی دایەوە( گومانی برد کەباس لە شەریعەت دەکات) ئایا نازانی من جولەکە نیم. ٤٢ - بەلام سەرۆکی مالومەکان و پیرانی گەل تۆیان داوە بەدەست منەوە. ٤٣- دەبڵێ لەبەر ئەوەی من ڕاستم، تا ئەوەی داد پەروەریە ئەوە ئەنجام بدەم، چونکە من دەسەلاتم هەیە کە بەرت بدەم یا فەرمان بدەم کە بت کوژن. ٤٤- یەهوزا وەلامی دایەوە: گەورەم بەڕاستگۆم بزانە گەر تۆ فەرمان دەرکەی بە کوشتنم ئەوە ستەمێکی گەورەت کردووە، چون کەسێکی بێ تاوانت کوشتوە. ٤٥- چون من یەهوزای ئەسخەریوتیم نەك عیسای جادوکەر کە بە جادوەکەی منی وا لێ کردوە. ٤٦- کاتێ والی ئەمەی بیست، سەرسام بوو، هەتا داوای کرد کە بەری بدەن. ٤٧- بۆیە چووە دەرەوە و بە پێکەنینەوە وتی: بەلاییکەمەوە لەکەمتری حاڵەتدا ئەم مرۆڤە شیاوی کوشتن نیە، بەڵکە دەبێ بەزەییمان پیابێتەوە. ٤٨ - پاشان والی وتی: ئەم مرۆڤە دەڵێت: من عیسا نیم بەڵکە یەهوزام، ئەوەی سەربازەکانی بردووە بۆ گرتنی عیسا. ٤٩ - وە دەڵێت عیسای جەلیلی بە هۆی سحریەوە منی کردۆتە خۆی. ٥٠ - ئەگەر ئەمە ڕاست بێ ئەوە کوشتنی ستەمێکی گەورەیە، چون ئەو کەسێکی بێ تاوانە.٥١ - بەلام ئەگەر ئەوە عیسا بوو، بەلام ئینکاری دەکرد ئەوە هەوە، ئەوە بەدڵنیایەوە تێکچووە، ئەگەر واش بوو ستەمە کەسێ شێت بووبێ بکوژرێ. ٥٢- لەو کاتەدا سەرۆکی مالومەکان و پیرانی گەل ونوسەرو فەریسیەکان هەموو هاواریان کرد، و وتیان: ئەوە

عیسای ناسریه، ئێمه باش دەیناسین. چون ئەگەر ئەو نەبایە ئەوە نەمان دەگرت و نەمان ئەدایە دەستی تۆ. ٥٣- ئەو شێت نیە بەڵکە کەسێکی پیسه. ٥٤- ئەیەوێ بە فێڵەکانی ڕزگاری ببێ لەدەستمان. ٥٥- خۆ ئەگەر ڕزگاری ببێ ئەوە ئەو ئاشوبێکی خراپ ترە لەوەی یەکەم جاری دەگێڕێ. ٥٦ - بەڵام بیلاتیس(ناوی والییه) ویستی لەم داوایە خۆی ڕزگار بکات، وتی ئەو خەڵکی جەلیله، هێرۆدسیش پاشای جەلیلیەکانه. ٥٧- ئیدی مافی من نیە کە فەرمان دەرکەم لەم داوایەدا.

٥٨- دەی بیبەن بۆ لای هێرۆدس. یەهوزایان برد بۆ لای ئەو هێرۆدسەی کە خۆزگەی دەخواست جارێ عیسا بچێ بۆ ماڵەکەی.٦٠ - بەڵام عیسا قەت بیری نەدەکردەوە کە بچێت بۆ لای. ٦١- چون هێرۆدس لەو نەتەوانە بوو کە خودای پڕو پوچ و درۆیان دەپەرست، ئەو دەژیا لە سەر داهاتی نەتەوەیەکی پیس. ٦٢ - کاتێ یەهوزایان کردەوە لەلای هێرۆدس پرسیاری لێکرد لە چەند شتێکی زۆر، بەڵام یەهوزا نەیتوانی بەباشی وەڵامی بداتەوە، هەر دەیوت: من عیسا نیم.

٦٣- لەوکاتەدا هێرۆدس و هەموو دەستودایەرەکەی گاڵتەیان پێدەکرد. بۆیە فەرمانی کرد کە پۆشاکێکی سپی لەبەر بکەن کە چۆن دەیکەنەبەری شێتەکان.

٦٤ - ناردیەوە بۆ لای بیلاتس وەپێی بڵێن: کەم تەرخەمی مەکە لە داد پەروەری لەگەڵ ئیسرائیلەکان. ٦٥- هێرۆدس ئەمەی بۆ نوسی چون سەرۆکی مالومەکان و نوسەرو فەریسیەکان پارەیەکی زۆریان دابویێ. ٦٦ - کاتێ والی بەمەی زانی، لەڕێی یەکێ لە خزمەتکارەکانی هێرۆدسەوە، خۆی وا نیشان دا کە دەیەوێ یەهوزا ئازادی بکا، تا ئەویش بەشکم شتێکی لەپارە دەست بکەوێ، ٦٧- بۆیە فەرمانی بەو بەندانە کرد کە پارەیان وەرگرتبوو لەلایەن نوسەرەکانەوە کەبیکوژن و دارکاری بکەن - بەڵام ئەو خودایەی کە ئەندازەی دەرئەنجامەکان دادەنێ ویستی یەهوزا

بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لە خاچ بدرێ. تا بیچێژێ ئەو مردنە سەختەی کە دەیویست کەسێکی تری پێوە بکات. ٦٨ ـ کەس نەی بیست کە یەهوزا لە ژێر ئەو دارکاریەدا مردبێ ئەگەر چی سەربازەکان زۆر بەتوندی دارکاریان دەکرد خەڵتانی خوێنیان کردبوو.

٦٩ ـ بۆیە کراسێکی کۆنی ئەرخەوانیان ـ وەك گاڵتە پێ کردنی ـ لەبەریان کردو پێیان دەوت ئەمە شیاوی پاشای نوێمانە کەپێویستە بە خشڵ پۆشتە بکرێ.

٧٠ ـ بۆیە لە دڕك و چیلکە تاجێکیان بۆ دروست کرد، وەك ئەو تاجەی کە لە ئاڵتون و بەردی بەنرخ دروست دەکرێ، و دەیکەنە سەر پاشاکان. ٧١ـ بەوشێوەیە تاجی دڕکاویان کردە سەری یەهوزا. ٧٢ـ وە قامیشێکیان وەك داردەستێ کردیانە دەستی و دایان نیشان لە شوێنێکی بەرزدا.٧٣ـ ئینجا سەربازەکان بەگاڵتە پێکردنەوە بەبەردەمیا دەڕۆشتن، خۆیان بۆ دائەنەوان سڵاویان لێدەکرد، وەك ئەوەی بۆ پاشای جولەکەکان دەکرا.٧٤ ـ دەستیان ڕا دەخست بۆئەوەی پارەو دیاری وەرگرن لێی، وەك چۆن پاشا نوێکان دەیان کرد.

٧٥ ـ کاتێ هیچیان لێ وەرنەئەگرت، دەکەوتنە لێدانی یەهوزا. ٧٦ـ پێیان دەوت: تۆ چۆن کراوی بە پاشاو ناتوانی ببەخشی بەسەرباز و خزمەتکارەکانت؟!

٧٧ـ کاتێ سەرۆکەکانی مالومەکان و نوسەرو فەریسیەکان بینیان یەهوزا نەمرد لە ژێر ئەو دارکاریەدا، ترسان کە بیلاتس ئازادی بکا، بۆیە پارەو دیاریان دا بەوالی کە بیداتە دەست نوسەر و فەریسیەکان، چون لایان وابوو ئەمە تاوان بارە وە مافی خۆیەتی دەبێ بمرێ. بۆیە بڕیاریان دا لە خاچ بدرێ لەگەڵ دوو دزی تردا. ٧٨ـ بۆیە بردیان بۆ سەر شاخی (جومجومە) کە باو وابوو کە لەوێ لە سێدارەی تاوانباران بدرێ، لەوێدا بە ڕووتی ـ وەك زیاتر لە بێ ڕێزکردنی ـ لە خاچیان دا.

٧٩ ـ یەهوزا هیچی بۆ نەدەکرا جگە لە هاوار، دەیوت خودایە بۆ وازت لەمن هێنا، ئەو تاوان بارە بۆی دەرچوو منیش دەبێ بمرم. ٨٠ ـ بەراستی بڵێم: دەنگی یەهوزا لەگەڵ دەم و چاو وکەسیەتی ئەو زۆر لە عیسا دەچوو، بەشێوەیەك کە قوتابیان و بڕواداران هەموویان پێان وا بوو کە ئەوە عیسایە. ٨١ـ بۆیە هەندێکیان دەرچون لە بەرنامە و فەرمانەکانی عیسا، وە پێیان وا بوو کە عیسا پێغەمبەرێکی درۆ بووە، وەئەو کارانەشی ئەنجام دەدا لە ڕێی سحرو جادوەوە بووە.

٨٢ـ چون عیسا دەیوت: من نامرم تا نزیك بونەوەی کۆتایی دنیا. ٨٣ـ وەهەتا ئەو کاتە ئینجا لەدونیا دەردەچم. ٨٤ـ ئەوانەی کەدامەزراو بوون لەسەر بەرنامەی عیسا، وا دڵگرانی دەهات بەسەریاندا کە دەیان دی یەکێ دەمرێ کە زۆر لە عیسا دەچێ، بەشێوەیەك بیریان چوبۆوە و عیسا پێی گوتبون. ٨٥ ـ بەو شێوەیەو بە هاوڕێیەتی دایکی عیسا چون بۆ شاخی (جومجومە). ٨٦ـ تەنها بۆ ئامادە بوون نەبوو لە بینینی مردنی یەهوزا، بەردەوام دەگریان ـ بەڵکە بەهۆی نیقۆدیمۆس و یوسفی ئەباریماسیائی یەوە لاشەی یەهوزایان بدرێتەوە تا بینێژن. ٨٧ ـ لاشەکەیان لە خاچەکە هێنایە خوارێ، بەگریانێکی هێندە زۆرەوە کە کەس بڕوای نەدەکرد. ٨٨ ـ ناشتیان لە گۆڕێکی نوێ کە هی یوسف بوو، دوای ئەوەی سەد هۆقە گڵیان خستە سەر گۆڕەکە.

○ بەشی دووسەد و هەژدە: (٩) بڕگەیە

١ـ هەموو گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان.٢ ـ ئەوەی ئەمە دەنوسێتەوە یۆحەناو یاقوبی برای لە گەڵ دایکی عیسا بەرەو ناسرییە بەڕێکەوتین. ٣ـ بەڵام ئەو قوتابیانەی کە لە خودا نەترسان شەو چون لاشەی یەهوزایان دەرهێنا و لە جێگەی تر شاردیانەوە، وە لە نێو خەڵکدا بڵاویان کردەوە کە عیسا هەستاوەتەوە.

٤ـ جا بەهۆی ئەمەوە شپرزەییەك ڕویدا. ٥ـ بۆیە سەرۆكی مالومەكان فەرمانی دا كە كەس باسی عیسای ناسری نەكا، ئەگەرنا ئەوا دەكەوێتە بەر سزای بەردبارانكردن. ٦ـ جا بەم هۆیەوە ئەشكەنجەیەكی زۆر گەورە ڕویدا، زۆرێك بەردباران كران، لێیان درا، دەربەدەركران، چونكە نەیان دەتوانی لەسەر ئەمە بێ دەنگ ببن. ٧ـ هەواڵەكە گەیشتە ناسریە، كە چۆن یەكێ لە خەڵكی ناسریە هەستاوەتەوە، دوای ئەوەی كەمردووە لە سەر خاچەكەی. ٨ـ ئەوەی ئەمە دەنوسێتەوە بەپەلە ڕۆشت بۆ لای دایكی عیسا، تا ڕازی ببێ و واز لە گریان بهێنێ، چون كوڕەكەی هەستاوەتەوە. كاتێ مەریەمی پاك ئەمەی بیست بەگریانەوە وتی: با بڕۆین بەرەو ئۆرشەلیم تا كورەكەم ببینم. ٩ ـ چون ئەگەر ببینمەوە ئەوە چاوەكانم ئۆخەی دەكەن.

○ بەشی دووسەد و نۆزدە: (١٧) بڕگەیە

١ـ مەریەمی پاك گەڕایەوە بۆ ئۆرشەلیم لەگەل ئەوەی ئەمە دەنوسێتەوە و یاقوب و یۆحەنا، لە دوای ئەو ڕۆژەی كە سەرۆكی مالومەكان ئەو فەرمانەی دەركرد.٢ـ مەریەمی پاك كە هەمیشە لە خودا دەترسا، وەسێتی بۆ ئەوانەی كە لەگەڵیدا بوون دەكرد، كە كوڕەكەی ئەو لەبیر بكەن، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی فەرمانی سەرۆكی مالومەكان ستەمە، ئای هەمووان لەبەرامبەر ئەمەدا چەندە هەڵدەچوون.٤ـ سوێند بەو خودایەی كە ئاواشتەی دڵەكان دەكات، دەزانێ هەندێكمان دڵگران بوین بە مردنی یەهوزا، كەلامان وابوو كە عیسای مامۆستامانە، وەهەندێكمان شادمان دەبووین بە زیندوبونەوە و هەستانەوەی.٥ـ جا ئەو فریشتانەی كە پاسەوانی مەریەمیان دەكرد ، چونەوە بۆ ئاسمانی سێیەم كە عیسا لەگەڵ فریشتەكانی ئەوێ بوو، هەموو ئەوەی ڕویدا بۆیان گێڕایەوە.

٦ـ بۆیە عیسا پاڕایەوە لە خودا کە ڕێی پێبدات کە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دایکی و قوتابیەکانی ببینێتەوە. ئیدی خوای بەبەزەیی فەرمانی بە چوار فریشتە نزیکەکانی کرد، کە بریتی بوون لە جوبرەئیل و میخائیل و ڕافائیل و ئۆریول، کە عیسا هەڵگرن بیبەنەوە بۆ ماڵی دایکی. ٨ـ وە فەرمانی پێکردن کە پاسەوانی بکەن بۆماوەی سێ ڕۆژ لەسەریەك. ٩ـ وە نەهێڵن کەس بیبینێ جگە لەوانەی باوەڕیان پێهێناوە.

١٠ـ عیسا بەشێوەیەکی شکۆدار هێنایانە ژورەکەی کە مەریەمی پاکی دایکی شەونوێژی تێدا دەکرد، وەهەروها خوشکەکەی و مەرسا و مەریەمی مەجدەلیە و لیعازر و ئەوەی ئەمە دەنوسێ (بەرنابا) ویۆحەنا و یاقوب و پوترۆس لەوێ بوون، ١١ـ هەموو لەسام و خۆشیدا دەتگوت وەك مردوو وەهابون. ١٢ـ عیسا دایکی لەزەویەکە بەرز کردەوە، و پێی وت: مەترسن چون من عیسام. ١٣ـ مەگرین چون من زیندوم و نەمردوم. ١٤ـ هەریەکەمان ماوەیەکی زۆر وەك کەسێکی گێژمان لێ هات، لە ئامادەبونی عیسادا. ١٥ـ چون هەمووان باوەڕیان وابوو کە عیسا مردووە.

١٦ـ لەو کاتەدا دایکی پاکی بەگریانەوە وتی: پێم بڵێ کوڕم بۆ خودا ڕێی بەوەدا کە تۆ بمریت و ریسوایی بەسەر خزمان وهاوەڵانت و ئایینەکەت بێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا هێزی ئەوەشی پێ دایت کە مردوو زیندوو بکەیتەوە. ١٧ـ چون ئەوەی تۆی خۆش ئەویست وەك مردوی لێهات.

○ بەشی دووسەد بیست: (٢١) برگەیە

١ـ عیسا باوەشی بەدایکیا کردو وەڵامی دایەوە: دایکی خۆم بەڕاستم بزانە، چون بەڕاست دەیڵێم کەمن قەت نەمردووم. ٢ـ چون خودا دەمپارێزێ تا کۆتایی دونیا. ٣ـ کاتێ ئەمەی وت پێی خۆش بوو چوار فریشتەکە دەر بکەون و شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی ڕویداوە. ٤ـ پاشان هەریەك لەو چوار فریشتەیە دەرکەوتن، وەك

خۆرێكی درەوشاوە.٥- هەتا جارێكی دی هەموو كاس بوین لە تاوا. ٦- ئیدی عیسا چوار پۆشاكی لەكەتان دا بە فریشتەكان كە خۆیانی پێ داپۆشن. تا دایكی و هاورێكانی بتوانن بیان بینن و گوێبیستی قسەكانیان بن. ٧- دوای ئەوەی هەموویان هەستانەوە، پێی وتن: ئەمانە فریشتە و نێراوی خودان، ٨ - جوبرەئیل كە نهێنیەكانی خودا دەگەیەنێ. ٩ - میخائیل ئەجەنگێ لەگەڵ دوژمنانی خودا. ١٠ - رافائیل ئەوەیە كە گیانی مردووان دەكێشێ.

١١- وە ئوریێل ئەوەیە كە بانگ لەدەستەڵاتی خودا دەكات لە رۆژی دواییدا. پاشان چوار فریشتەكە چیرۆكەكەیان گێرایەوە بۆ مەریەمی پاك، كە چۆن خودا ناردنی بۆلای عیسا، وێنەی یەهوزای گۆری بۆئەوەی سزا بچێژێ لەسەر ئەوەی كەویستی ئەو بفرۆشێ.١٢- لەو كاتەدا ئەوەی ئەمە دەنوسێ (بەرنابا) وتی: ئەی مامۆستا ئایا بۆم هەیە پرسیارت لێبكەم ئێستا، هەروەك ئەوەی بۆم هەبوو لەكاتێ لە ناوماندا بویت؟١٣- عیسا وەڵامی دایەوە ئەی بەرنابا بەو یستی خۆت بپرسە وەڵامت دەدەمەوە. ١٤- ئەوەی ئەمەدەنوسێ وتی:ئەی مامۆستا ئەگەر خوا بە بەزەییە، بۆچی بەم ئەندازەیە ئەشكەنجەمان دەدات، تا وای لێ هات هەموومان بروامان وابوو كە تۆ مردوی. ١٥- دایكت هێندە بۆت گریا، خەریكبوو لەتاوا بمرێ.

١٦- وەچۆن خودا رێیدا كە بێتە سەرت ئەم بێ ئابروییەی، كە بتكوژن لە نێوان دزەكاندا لەسەر شاخی جومجومە، كە تۆی كەسی پیرۆزی خودا.

١٧ - عیسا وەڵامی دایەوە بەراستم بزانە ئەی بەرنابا، خودا سزای هەموو تاوانێك دەداتەوە گەر بچوكیش بێت، بە سزایەكی گەورە چون خودا تورە دەبێ لە تاوان كردن. ١٨ بۆیە كاتێ دایكم و قوتابیە ئەمیندارەكانم كە لەگەڵمدا بوون منیان كەمێك خۆش دەویست خۆشەویستیەكی جیهانی، بۆیە خوای چاكەكار ویستی كە

سزای ئەو خۆشەویستیە بە دڵگرانی بداتەوە تا سزاتان نەیات بە ئاگری جەهەنەم. ١٩ ـ کاتێ خەڵکی بانگی دەکردم وەك خودا وەیا بەکوڕی خودا، کەمن لێیان بێ بەری بووم، خودا ویستی کەخەڵکی گاڵتەم پێ بکەن لەم دونیایەدا، بەمردنی یەهوزا کە خەڵکی پێیان وابوو من مردوم، لە سەر خاچەکە، تا شەیتان گاڵتەم پێنەکا لە ڕۆژی دوایی و دەستەڵاتی خودادا. ٢٠ـ ئەوە بەردەوام دەبێ تا هاتنی موحەمەد کە نێراوی خودایە، وەهەرکات هات ئەو فێڵە دەرئەکەوێ بۆ ئەوانەی بڕوایان بە شەریعەتی خودا هەیە. ٢١ـ دوای ئەوەی کە عیسا ئەم قسانەی کرد، وتی: تۆ دادپەروەری ئەی خوای پەروەردگار، چون هەر تۆ شایستەی ڕێزو شکۆییت بەبێ کۆتایی.

○ بەشی دووسەد و بیست ویەك: (٢٤) بڕگەیە

١ـ عیسا لای کردەوە بەلای ئەوەی ئەمە دەنوسێتەوە پێی وت: ئەی بەرنابا پێویستە لەسەرت ئینجیلی من بنوسیتەوە، وەئەوەی ڕویداوە بەسەرمدا لەو کاتەی کە لەم دونیایەدا بووم. ٢ـ وەئەوەی بەسەر یەهوزاشدا هات، بینوسە تا ئەو فێڵەی بەسەر بڕواداران هات نەمێنێ و تا هەموو کەسێ ڕاستی بزانێ. ٣ـ لەوکاتەدا ئەوەی ئەمە دەنوسێتەوە وتی: من ئەم کارە دەکەم بە پشتیوانی خودا ئەی مامۆستاکەم.

٤ـ بەڵام من نازانم چی بەسەر یەهوزادا هات، چون من هەموو شتێکم نەدی.

٥ـ عیسا وەڵامی دایەوە ئەوە یۆحەناو پوترۆسە هەردوکیان هەموو شتێکیان بینیوە، پێت دەگەیەنن بە هەموو ئەوەی ڕویداوە. ٦ـ پاشان عیسا داوای لێ کردین قوتابیە دڵسۆزەکانی بۆ بانگ بکەین تا بیان بینێ، هەر لەو کاتەدا یاقوب و یۆحەنناو حەوت قوتابیەکە لەگەڵ نیقۆدیمۆس و یوسف و خەڵکێکی زۆر لە حەفتاو دوو کەسەکە کۆبونەوە و نانیان لەگەڵ عیسادا خوارد. ٧ـ لەڕۆژی سێیەمدا عیسا

وتی: بڕۆن لەگەڵ دایکمدا بۆ چیای زەیتون. ٨ـ چون من لەوێوە بەرز ئەکرێمەوە بۆ ئاسمان. ٩ـ ئەوجا دەبینن کە کێ من بەرز دەکاتەوە. ١٠ ـ هەموو ڕۆشتن جگە لە بیست و پێنج لە حەفتاو دوو قوتابیەکەی.١١ـ ئەوانەی رایان کردبوو بۆ دیمەشق لەترسا.١٢ ـ کاتێ هەمووی وەستا بوون بۆ نوێژ، ١٣ ـ عیسا لە نیوەڕۆدا هات لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە فریشتە کە پاك و بێگەردیان بۆ خودا دەکرد. سەرسام بوون لە بڵندی ڕووی ئەو. ١٤ـ بۆیە ڕوویان نەویکردە سەر زەوی. بەڵام عیسا هەڵی ساندن و پێی وتن: مەترسن من مامۆستاکەتانم. ١٥ـ پاشان سەرزەنشتی زۆرێك لەوانەی کرد کە باوەڕیان وابوو کە ئەو مردووە وە هەستاوەتەوە، وە پێی وتن: پێتان وابوو کەمنم، سوێند بەخوا درۆزنن. ١٦ـ چون خودا پێی بەخشیوم کە بژیم تا نزیك بوونەوەی کۆتایی دونیا، هەروەك چۆنم پێوتوون. ١٧ـ بەڕاستی پێتان دەڵێم: من نەمردووم بەڵکە یەهوزای خائن بوو. ١٨ ـ ئاگادار بن چون شەیتان دەیەوێ بتان خەڵەتێنێ. ١٩ ـ بەڵام ببن بە شایەتی من لە نێو هەموو ئیسرائیلیەکاندا وە لەناو هەموو جیهاندا، لە سەر هەموو شتێ کە بینیوتانە و بیستوتانە. ٢٠ـ لەدوای ئەوەی کە ئەمەی وت، نوێژی بۆ خوا کرد لە پێناوی ڕزگاری بڕواداران، دەست پێکردنەوەی هەنگاوەکان ٢١ـ کاتێ لە نوێژ بووەوە باوەشی بەدایکیدا کردو پێی وت: سڵاوی خوات لێ بێ ئەی دایکم ٢٢ـ پشت بەوە بەستە کە من و تۆی دروست کردووە. ٢٣ـ دوای ئەمە، لای کردەوە بەلای قوتابیەکانی پێی وتن: داواکارم کە ڕۆزی و بەزەیی خواتان لەگەڵ بێ.٢٤ـ پاشان چوار فریشتەکە لەبەر چاوی ئێمەوە بەرزیان کردەوە بۆ ئاسمان.

○ بەشی دووسەد و بیست دوو: (٦) بڕگەیە

١ـ پاش ئەوەی عیسا ڕۆیشت، قوتابیەکانی جیا بوونەوە بە ناوچەکانی ئیسرائیل و هەموو جیهان. ٢ـ ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە بێزراوە لەلای شەیتان، ناڕاستی ئەشکەنجەی دەدا بەردەوام. ٣ـ بەشێ لە خراپەکاران کەپێیان وایە قوتابی عیسان مژدەیان دەدا، کە عیسا مردووە وە هەڵناسێتەوە. ٤ـ وە ئەوانی تر مژدەیان دەدا، وە بەردەوام مژدەش دەدەن کە عیسا کوڕی خوایە. ٥ـ وە لەناو هەڵخەڵەتاوەکاندا پۆڵسە. ٦ـ بەڵام ئێمە مژدە دەدەین بەوەی لە خوا ترساوان نوسیویانە، بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێ لە ڕۆژی دوایی لە دەسەڵات و لێپرسینەوەی خودا ... ئامین.

******************

## لەکۆتاییدا دوا قسەی ئێمە ئەمەیە

پاش ئەوەی ئاماژەمان بە کرۆکی ئینجلی بەرنابا کرد، ئێستا لەنێوان دوو گریمانەداین:

- گریمانەی یەکەم ئەوەیە کە باوەڕ بکەین ئەم ئینجیلە نوسراوەتەوە لە سەدەی شانزەهەم، جا لەلایەن هەر کەسێکەوەبێ، وەیا لە هەر سەردەمێ بوو بێ، وەیا لەو سەردەمەی کە قەشە فرامرینۆ تێیدا دۆزیویەتیەوە.
- گریمانەی دووەم ئەوەیە کە بڵێین ئەم ئینجیلە ڕاستە لە لایەن قەشە بەرنابا نوسراوەتەوە ـ ئەو قەشەیەی کە پیاو چاکێ بوو دڵی پڕ بوو لە باوەڕ هەروەك لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە.

ئەگەر بێینە سەر گریمانەی یەکەم ئەوە دەڵێین: پێشتر باسمان کرد کە گومان جارێك لەهەڵچوندایە جارێ لەڕۆچوندایە بەشێوەیەك لە چەند ڕوویەکی جیاوازەوە وتوێژی لەسەرکراوە، لەوانە باوەڕت پێداکات کە ئەمە دروست کراوە، وەلە لایەکی دیکەوە قەناعەتت پێ ناکا کەدروستکراوە، هەروەك دکتۆر سعادە لە پێشەکی وەرگێڕانی ئەم ئینجیلەدا باسی کردوە، واتە لەنێوان گوماندا دەمێنینەوە..

وەئەگەر بێینە سەر گریمانەی دووەم، ئەوا لەم بارەوە ئەم وتەیەمان هەیە:

ئەگەر ئەم ئینجیلە ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیە، وە قەشە بەرنابا نوسیویەتیەوە، ئەوا هیچ ئینجلێ نیە بەدەر بێ لەتێکچون وسوتان و فەوتاندن بە هەر ڕێگایەك بێ، دوای ئەوەی کە ئەم ئینجلە قەدەغەکراوە، لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە: ئایا قەشە بارنابا ئەم ئینجیلەی بە چ زمانێك نوسیوەتەوە، بەزمانی عیبرانی یا یۆنانی نوسیویەتیەوە، هەرچیەك بێ گرنگ

نیە بەڵام تێبینی ئەوە بکە کەئەم ئینجیلە کە دۆزرایەوە لە کتێبخانەی قەشە سکتنس لە ڕۆما بەزمانی ئیتالی نوسرابوو، ئەوەش دەمانباتە سەر ئەوەی کە ئاخۆ چەند جار ئەم ئینجیلە لەبەری گیراوەتەوە، یا بەچەند زمان وەرگێڕاوە ولەچەند سەدەی جیاوازدا، کە زیاتر لە شانزە سەدە دەستاو دەستی پێکرا بێ، بێگومان هەموو ئەمانە کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر دەقی ئینجیلەکە هەیە لە گۆڕینی ڕستەو مانا، وەیا کەوتن و سڕینەوەی وشەیە یا واتایەك، جا بەدەستی ئەنقەست بێ یا نا.. هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێ کە قەشە بەرنابا سەرباسی بۆ بەشەکانی ئەم ئینجیلە نوسیوە، بەڵام وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا تا بەشی بیست و حەوت سەرباسی هەیە، جا دەپرسین ئایا هەموو بەشەکانی ئەم ئینجیلە سەرباسیان هەن یا نا؟ ئەگەرنا بۆچی تەنها ئەو بیست وحەوت بەشە سەرباسی هەیە؟ ئەگەر ئا هەمووی هەیەتی ئەدی ئەو سەرباسانەی تری بۆ تێدانیە! ئەگەر لابرابێ یا قرتێندرابێ لەکاتی لەبەرگرتنەوەیدا، باشە بە چ هۆکارێ ئەم کارە ئەنجام دراوە؟ هەموو ئەمانە دەمانبەن بۆ دوو شت:

یەکەم: ئەم ئینجیلە تازەکی ئەنوسراوەتەوە، چون ئەگەر وا بێ و بڵێین لە سەدەی شانزەهەمدا نوسراوە، هەروەك گومانکاران دەڵێن، ئەوە باشتر و چاکتر دادەڕێژرا، لەڕێکخستن و ڕیز بەندی وە هەموو سەرباسەکانیش دەنوسرانەوە.

دووەم: ئەمانەی باسمان کرد دەمانباتە سەر ئەوەی کە ئەم ئینجیلە گومانی تێدا نیە کەتەواوەو با وشەیەك یادەستەواژەیەك یا بە لابردنی سەرباسێ گۆڕابێ یا فەوتاو بێ، وە بە هەر شێوەیەکیش وای لێ هاتبێ گرنگ نیە، گرنگ

ئەوەیە ناوەڕۆکی ئەم ئینجیلە هەمان ناوەڕۆکی ئینجیلی بەرنابایە کە قەشە بەرنابا نوسیویەتیەوە..

پێویستە ئەوەمان لە بیر نەچێ کە ئەم ئینجیلەو وە هەموو ئینجیلەکانی تری جا ڕێپێدراوبێ یا قەدەغەکراو بێ، نەنوسراونەتەوە لە ژیانی مەسیح دا، بەڵکە لە دوای بانگەوەزگەی و بەرزکردنەوەی بووە بۆ ئاسمان نوسراوەتەوە، ئینجیلی بەرناباش بەهەمان شێوەیە.

پاشان لێکدانەوەو دارشتنی زمانەوانی هەر ئینجیلێك هەڵقوڵاوی بیری و ئاستی ئەو نوسەرەیە کە ئینجلی نوسیوەتەوە، بۆیە هەر هەڵەو کەم و کورپەك هەبێ، ئەوە نا گەڕێتەوە بۆ حەزرەتی مەسیح بەڵکە دەگەرێتەوە بۆ ئەو نوسەرە.

ئەمە هەموو ئینجیلەکان دەگرێتەوە بەتایبەت ئینجیلی بەرنابا چون ئینجیلی بەرنابا لەم شوێن بۆ ئەو شوێنی زۆر کردووە، لەم وەرگێر بۆ ئەو وەرگێڕ، لەم لەبەرگرەوە بۆ ئەو لەبەرگرەوە زۆری بەسەر هاتووە، لە نێوان شازدە سەدەدا، بەتایبەت لە سالآنێکدا کە ئەوروپا لە ژێر سایەی کڵێسەدا دەژیا، بە هەموو شێوەیەك ئەم ئینجیلە قەدەغەکراو بوو، وەهەرکەسێ ئەم ئینجیلەی پێ بگیرایە یا باوەڕی پێ ببوایە ئەوە لەلای کڵێسە بە کافری بێ باوەڕ لەقەڵەم دەدراو توشی ئەشکەنجە و گرتن دەبۆوە ..

تێبینی ئەوە بکە کە ئەم ئینجیلە نەکەوتەوە بەرچاو تا ئەوروپا سەردەمی کڵێسە سالاری و حوکمی ئاخوند وقەشەکانی تێدا نەماو لاواز بوو، بگرە لەسەرەتای ڕاپەڕین و بوژاندنەوەی ئەوروپا ئینجا ئەم ئینجیلە سەری هەڵدایەوە، وەك دکتۆر خەلیل سعادە لە پێشەکیەکەیدا دەڵێت: کاتێ هەواڵی ئینجیلی بەرنابا بڵاو بۆوە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە نێو یانەو مۆڵگا ئایینی و زانستیەکاندا ڕوداوێکی

زۆرگەورەی نایەوە بە تایبەت لە وڵاتی ئینگلتەرا، جا بەهۆیەوە مشت و مڕێکی زۆر کەوتەوە.. بەڵام بەداخەوە ئێمەی موسوڵمانیش تا ئێستا بێ ئاگاین لە ناوەڕۆك و بەسەرهاتی ئەم ئینجیلە!!

**ڕووداوێکی مێژووی کە ڕوویدا لە نێوان موحەمەد پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێت) لەگەڵ گاورەکانی نەجران کە لە شاری مەدینە بوون .**

جێی خۆیەتی ئاماژە بەو ڕوداوە بدەین کە ڕوویدا لە سەردەمی پێغەمبەرمان موحەمەد (درودی خوای لێبێت) کە بەهۆیەوە مشت ومڕێ دروست بوو لەنێوان موسوڵمانان و ئەو گاورانەی نەجران کە دانیشتوی شاری مەدینە بوون، و لەسەر ئایینی مەسیح بوون.

هۆکاری ئەم ڕووداوە لەسەر ئەوەوە هات کە پێغەمبەری خوداو موسوڵمانان دەیان وت: عیسا یەکێکە لەو پێغەمبەرانە کە خودا ناردویێتی، وە خودا دروستی کردووە، هەروەك چۆن خودا ئادەمی دروست کردووە، نەك وەك ئەوەی گاورەکان دەڵێن کە عیسا خودایە، جا لەو کاتەدا چەند ئایەتێکی قورئان دابەزی کە پێی دەوترێ (ئایەتی پاڕانەوە ـ آیة المباهلة)[1] ﴿ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْـَٔايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ۝ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ۝ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ۝﴾[2].

---

[1] وشەی (المباهلة) لە (إبتهال) وە هاتووە لەزمانەوانیدا بەمانای نزاو پاڕانەوە دێت، وە لەبنچینەدا لە (الالتعان) وە هاتووە بەمانەی نەفرین کردن، واتە دورکەوتنەوە لە بەزەیی و میهرەبانی خودا. بنواڕە: کشف المشكل عن الصحيحين لابن الجوزي:١/٥٧٥، وەرگێڕ.

[2] سورة آل عمران : الآيات ٥٨ ـ ٦١

واتە: ((ئەوەی بۆت باس دەكەین لە بارەی عیساو ڕەوشتی جولەكەكان لەگەڵیدا، ئەوە وەحیی ئێمەیە بۆ تۆ، نمونەی دروست كردنی عیسا بەبێ باوك وەك دروست كردنی ئادەمە، كە خودا بەبێ دایك و باوك، بەڵكە لە گڵ دروستی كردوە، پاشان پێی فەرمووە ببە دەست بەجێ بووە، ئەی پێغەمبەر ئەوەی بۆمان ڕونكردیتەوە سەبارەت بەدروست كردنی عیسا بە بێ باوك ئەوە ڕاستیەكە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە ئەی پێغەمبەر لەم رووەوە تەواو دڵنیا بە و هیچ گومانێ ڕووت تێ نەكات، هەر كەسێ لە بارەی عیساوە مشتومڕو دەمەدەمی لەگەڵ كردی، پاش ئەوەی ڕاستیەكەی بۆ ڕوون بۆوە، پێیان بڵێ ئەگەر ئێوە لە بیروباوەڕی خۆتان ڕاست ئەكەن وەرن با هەموومان كۆ ببینەوە، منداڵی ئێمەو مندالآنی ئێوە، ئافرەتانی ئێمەوە ئافرەتانی ئێوە خۆمان و خۆتان، پاشان داوا لە خودا بكەین كە نەفرینی خۆی بداتە ئەو لایەنەی كە درۆزنە))[1].

لەسەرئەمەوە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) داوای لێكردن كە بەڕێزترین كەسی خۆیان لە منداڵ و ژن و پیاوان بهێنن، وە هەروەها پێغەمبەری ئازیزیش بە ڕێزترین كەسی موسوڵمانان لە منداڵ و ژن و پیاوان بەرێت پاشان بپاڕێنەوە داوا بكەن لە خودا كە توڕەیی خۆی بنێرێ بۆ سەر ئەوەی لە سەر حەق و ڕاستی نیە.

ئەبو حارسە كە قەشەیەكی گاورەكانی نەجران بوو لەسەر ئەمە ڕازی بوو. ئەم ئاخوندە بە كۆمەڵێ لە گاورانی وت: بڕوانن لە موحەمەد، منداڵ و كەسەكەی دەبینن كە دێن بۆ پاڕانەوە..

---

[1] بنواڕە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل٥٧، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی نظام الدین عبدالحمید:١/١٣٦، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي: ١٠٢/٤، تفسیر الجلالین:ص٥٧، وەرگێڕ.

بۆ بەیانی موحەمەد (درودی خوای لێبێت) دەستی عەلی کوڕی ئەبی تالب و حەسەن و حوسێن و فاتیمەی گرت هێنانی بۆ ئەو جێیەی کە پاڕانەوەکەی تیادا ئەنجام بدرێ، وە گاورەکانیش هاتنە دەرێ لەپێشیانەوە گەوری ئاخوندەکەیان دەڕۆی .. کاتێ پێغەمبەریان بینی بەو شێوەیە لێیان پرسی ئەمانە کێن؟ وتی ئەوە کوڕی مامەو ئەوە کچمەو ئەوانەش کچەزامن[1] .. پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) لەسەر ئەژنۆ لەسەر زەوی خۆیدا بە زەویدا، لەوێدا ئەبو حارس وتی: سوێند بەخوا بە شێوەیەك چۆتە چۆك، هەروەك پێغەمبەرانی پێشوتر چۆن چونەتە چۆك بۆ پاڕانەوە، بۆیە وتی: ئەی باوکی قاسم، ئێمە لەگەڵت پاڕانەوە ناکەین بەڵکە ڕێئەکەوین صوڵحت لەگەڵ دەکەین ..

دەگێڕنەوە قەشەی گاورەکان وتویەتی: سوێند بەخوا، ئەمن دەم و چاوێ دەبینم ئەگەر داوا لە خودا بکەن کە شاخێ هەڵکەنێ لە جێگاکەی خۆی ئەوە بۆیان هەڵئەکەنێ. بۆیە لەگەڵیان مەیەنە پاڕانەوە چون لەنێو دەچن ، ئەوجا لەسەر زەوی نامێنێ گاورێ تا ڕۆژی دوایی و هەستانەوە.

کاتێ نوێنەری نەجران گەڕانەوە زۆرێك نەڕۆشتن (سەید و عاقب)[2] گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) وە خشڵێك و گۆچانێك و پەرداخێك و جوتێ نەعلیان بەدیاری دایە و موسوڵمان بوون [3].

---

[1] ئەبو نوعەیم دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) بە عەلی و فاتمەی وت کە دوعام کرد ئێوە بڵێن ئامین، بەڵام نوێنەری گاورەکان ڕازی نەبوو بۆیە داوای صوڵحی کرد ئیبنو عەباس دەڵێت: خۆ ئەگەر ئەوانەی کە چوبونەدەرەوە بۆ پاڕانە، ئەگەر پاڕانەوەکە ببوایە ئەوە ماڵ و منداڵیان لە نێو دەچوو.. بنوارە: تفسیر الجلالین: للمحلي والسیوطي:ص٥٨، وەرگێڕ.

[2] دوو کەس بوون بەناوی( السید والعاقب) کە سەرکردەو گەورەی نوێنەری نەجران بوون . وەرگێڕ.

[3] بنوارە: مجمع البیان : ١/ ٤٥١.

دەرەنجام بەهۆی ئەمەوە زۆرێك لە ئاخوند و قەشە و خواناسە گاورەكان موسوڵمان بوون. ئەمە بانگەواز و داوایەكی قورئانە بۆ هەموو مەسیحی و گاورەكان لە سەرەتای ئیسلام و تا كۆتایی مرۆڤایەتی ..

بەڵێ: زۆرێك لە مەسیحی و گاورەكان كە لەسەر بەرنامەو ڕێبازی حەزرەتی عیسا دەڕۆشتن موسوڵمان بوون چون ڕاستیان بۆ دەركەوت ئەقڵیان بەرەو ئیسلامی هێنانیەوە..[1].

لەكۆتاییدا ئەم چەند ئایەتەی قورئان دەهێنینەوە لە سەر بیرو باوەڕی ئەو مەسیحیە لادەرانەی كە پێیان وایە عیسا ـ پەنا بۆ خودا ـ خودایە، یا كوڕی خودایە، یا بەشێكە لە خواوەند، تا بزانن فەرمانی ئیسلام دەربارەیان چیە، ئەگەر لەسەر ئەو بیرو باوەڕە پوچ و ناڕاستە بن.

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٦﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا

---

[1] بنواڕە : إلى كل مسيحي: وفد المباهلة : ص٦٠ ، الشيخ كمال معاش.

وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ۝ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ۝ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ۝ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ۝ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ۝ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۝ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾[1].

**واتە: ((بەڕاستی ئەوانەی وتیان: بێگومان عیسای کوڕی مەریەم خودایە، ئەوانە کافر بوون، عیسا لەکاتی خۆیدا بە شوێنکەوتوانی خۆی وت: ئێوە عیبادەتی خودا بکەن، چونکە هەر ئەو پەروەردگاری منیش و ئێوەشە، بێگومان هەر کەسێك هاوتاو وێنە بۆ خودا دابنێت، خودا بەهەشتی لێ حەرام دەکات، وەهەتا هەتایە جێگەی ئاگری دۆزەخ دەبێت، چونکە هاوەڵ بڕیاردان بۆ خودا ستەمێکی زۆر گەورەیە، ستەمکارانیش لە ڕۆژی دواییدا هیچ یارمەتیدەرو پشتیوانێکیان نیە. ئەوانەی دەڵێن: خودا سێیەمی ئەو سیانەیە کە خودان، بێ سۆ کافرو بێ باوەڕن، کە مەبەستیان خوداو عیساو ڕۆحی قودسە، هیچ کەس خودا نیە جگە لە خودای تاقانە، ئەوانەی کە دەڵێن: خودا سیانە، ئەگەر لەو بیرە هەڵەو ناڕەوایە پەشیمان نەبنەوە وازی لێ نەهێنن، بێگومان سزای پڕ ئازار دەچێژن. ئایا پەشیمان نابنەوە ناگەڕێنەوە بۆلای خودا لەو کارەو بیرو باوەڕە هەڵەیەیان، وە هەرکەس بگەڕێتەوە**

[1] سورة المائدة : الآيات : ٧٣ ـ ٨٢.

وتەوبە بکات، ئەوا خودا زۆر لێ خۆش بوو و بەزەییە. مەسیحی کوڕی مەریەم چیە جگە لەوەی پێغەمبەرێکە وەك پێغەمبەرانی پێش خۆی، دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاستگۆ و خاوەن باوەڕێکی ساغ و پتەو بوو؟ عیساو دایکی هەروەك خەڵکی تر مرۆڤ بوون و برسیان بووە و خواردنیان خواردووە، ئەی پێغەمبەر سەرنج بدە و بزانە چۆن بیرو باوەڕی ڕاستیان بۆ ڕوون دەکەینەوە، کەچی ئەوان لەسەر بیرو باوەڕی هەڵەی خۆیان دەڕۆن لە گوێگرتن و شوێنکەوتنی هەق خۆیان لادەدەن. ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئایا چۆن ئێوە جگە لە خودا کەسێك دەپەرستن کە توانای زیان پێگەیاندن یا خود قازانج گەیاندنی نیە، ئەویش بەندەیەکە و دروستکراوێکە وەك ئێوە؟! خودا هیچی لێ ون نابێت نە لە بیرو باوەڕ نە لە کردەوە، چونکە هەر ئەو خودایە کە زۆر بیسەرو زانایە. ئەی خاوەن کتێبینە زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا و خۆتان دوور بخەنەوە لە بیروباوەڕی پڕو پوچ و خەرافیات، ئەی خاوەن کتێبەکان! مەکەونە شوێن هەوا و ئارەزووی ئەوانەی کە لە مەو پێش لە بیرو باوەڕو کردەوەدا گومڕا بوون، گەلێك کەسی تریشیان گومڕا کردوە، ئەوانە لە ڕێگای ڕاستی ئاین لایان داوە. ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون لە نەوەی ئیسرائیل لە سەر زمانی داود وعیسای کوڕی مەریەم نەفرینیان لێ کراوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی لە بەرنامەی خودا ترازاون، یاخی بوون و هەمیشە دەستدرێژی دەکەن. ئەوانە بە کردەوەی خراپی یەکتری قاییل بوون وەجڵەوگیرییان نەدەکرد لە کردەوە خراپەکانی یەکتر، جا لەبەرئەوە هەموو کارێکی خراپ و ناشرین لەناویاندا پەیدا بووبوو. ئەی پێغەمبەر زۆرێك لەو جولەکانە دەبینیت، کە لەگەڵ بت پەرستەکاندا پەیمان دەبەستن و هانیان دەدەن شەڕتان لەگەڵ بکەن، ئەم دوژمنایەتیەی لەگەڵ ئێوەدا دەیکەن ئەوە خراپترین کارە

ئەنجامی دەدەن، هەر ئەم هەڵوێستە ناشرین و خراپەیان وای کردوە خودا ڕقی لێیان ببێتەوە. ئەوانە هەمیشە وهەتا هەتایە لەناو ئاگری دۆزەخا دەمێنەوە، ئەگەر ئەوان ئیمانیان بە خوداو پێغەمبەرەکەیان وبەوەی بۆیان نێراوەتە خوارەوە (تەورات) بهێنایە، هەرگیز ئەو بت پەرستانەیان نەدەکردە پشت و پەنای خۆیان، وەپشتیان پێنەدەبەستن، وە دوژمنایەتیان لەگەڵ ئێوەدا نەدەکرد، بەڵام زۆرینەیان لەڕێگا ترازاون و فاسقن. سوێند بێ ئەی پێغەمبەر تۆ دەبینیت وبۆت دەردەکەوێت کەسەرسەخت ترین کەس لە دوژمنایەتی لەگەڵ ئیمانداراندا جولەکەکانن و بت پەرستەکانن، وەسوێند بێ ئەی پێغەمبەر بێگومان بۆت دەردەکەوێت نزیکترین کەس لەوانە کەموسوڵمانەکانیان خۆش بوێت ئەوانەن کە دەڵێن: ئێمە گاورین، چونکە ئەوانە کۆمەڵێك قەشەی زانیارو چەند لەخواترسی گۆشە نشینیان تێدایە، جا ئەوانە بە پەند و ئامۆژگاری ڕێنمایی شوێنکەوتوەکانیان دەکەن و لەئاستی حەق و ڕاستی لوت بەرزی ناکەن. ئەگەر ئەوانە گوێیان لەو قورئانە بێت کە بۆ پێغەمبەر هاتۆتە خوارەوە، دەیان بینیت ئەسرین بە چاوەکانیاندا بە خوڕ دێتە خوار، چونکە چاك دەزانن ئەوە هەقەو لەلایان خوداوە نێردراوە، جا لەبەر ئەوە دەڵێن: خودایە وا ئێمە ئیمانمان هێنا تۆش بەشایەت بماننووسە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شایەتن لەسەر ڕاستیەتی ئایینی ئیسلام و قورئانی پیرۆز کەلەلایەن تۆوەیە))[١].

**********************

[١] بنوارە: قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار:ل١٢٠، تەفسیری گوڵشەن: نوسینی نظام الدین عبدالحمید:١/٣٠٠، تفسیر الجلالین:ص١٢٠، وەرگێڕ.

# پێرست

# چەند وێنەیەک لە دەست نوسی ئینجیلی بەرنابا




Ancient: The discovery of this leather bound text will cause the collapse of Christianity worldwide, Iran has claimed



il proffeta che dio ti manda • il pregò iesu dicendo
fratelo taui che non dici niente ma quanto piu preg
gaua tanto piu chridaua he che il proffeta he che il san
to di dio • alle quali parole ricorsero molti che si
partiuano di ierusalem he entrorno con iesu in ieru
salem dicendo quello che dio per iesu haueua fato nel
leproso

primo sermone di iesu fato al popullo
mirabile di dotrina circha al nome di dio

Comosse tutta la cità di ierusalem queste parole
onde tutti concorsero al tempio per uedere iesu il
quale iui hera hentrato affare oratione • talmẽ
te che a pena ui chapiuano pero pregorno li saced
doti iesu dicendo • questo popullo desidera ueder
ti he audirti pero assiendi nel pinacholo he se dio ti
da parola parlla in nome del signore • assese ad
donque iesu sopra il locho doue li scribi parllauano
• he fato segno di silentio con la mano aperse la bo
cha sua dicendo • sia benedeto il santo nome di dio
il quale per sua bontà he misericordia uolse chrea
re le sui chreature le quali il glorifichasero • sia be
ne deto il santo nome di dio il quale chreo il splend
redi

لەم کتێبەدا چ فێر دەبیت ، چ دەخوێنیەوە ؟

- ئینجیل چیە؟ ناوەڕۆکی چیە؟
- ئەی چوار ئینجیلی (مەتا و مەرقەس و لۆقا و یۆحەنا) هەروەها کتێب و نامەکانی نێراوان چین و لە چی دەدوێن؟
- چیرۆکی ئەو ئینجیلانە چین کە قەدەغەکراون؟
- پەیمانی سەدەی تازە و پەیمانی سەدەی کۆن و کتێبی پیرۆز چین؟ باس لە چ دەکەن؟
- قەشە بەرنابا کێیە؟ ئەی ناوەڕۆکی ئینجیلەکەی چیە؟ کە بۆتە ئەوەی حەرام بکرێت کە نا بێ بخوێندرێتەوە؟
- چیرۆکی قەشەی خواناس (فەرامرینۆ) کە ئینجیلی بەرنابای دۆزیەوە چۆن بوو؟